٣

# جەنگی چاڵدێران

## لە کۆمەڵە توێژینەوەیەکدا

کۆمەڵە نووسەرێک

وەرگێڕانی وریا بەهائی



# جەنگی چاڵدێران
# لە کۆمەڵە تۆژینەوەیەکدا

کۆمەڵە نووسەرێك

وەرگێڕانی
وریا بداغی

سەرپەرشتیاری پرۆژە
رابیعە فەتاح شێخ محەمەد

خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

● ساڵوەگەڕی پێنجسەد ساڵەی جەنگی چاڵدێران ـ ٣

● جەنگی چاڵدێران لە کۆمەڵە توێژینەوەیەکدا

● نووسینی: کۆمەڵە نووسەرێك

● وەرگێڕانی بۆ کوردی: وریا بداغی

● سەرپەرشتیاری پرۆژە: رابیعە فەتاح شێخ محەمەد

● نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی

● بەرگ: هۆگر سدیق

● نرخ: (٣٠٠٠) دینار

● چاپی یەکەم : ٢٠١٤

● تیراژ: ٥٠٠ دانە

● چاپخانە: چاپخانەی موکریانی (هەولێر)

● لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردن: ( ١١٣) پێدراوە

زنجیرەی کتێب (٩٢١)

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك

# پێشەکیی وەرگێڕ

کەسێک ڕەنگە ناحەقی نەبێت بڵێ: باشە لەو مێژووە خوێناوییەی کورد و لەو هەمووە کارەساتانە، بۆ ڕاست چاڵدێران؟! بۆ لەوێ لەنگەرمان گرتووە؟ باشە مێژووی چاڵدێران بۆچی بۆ کورد ئەوەندە گرنگە؟ خۆ شەڕی دوو ئیمپراتۆری غەیرە کورد بوو!؟ مادام، کە ئێمە بمانەوێ مێژوو بخوێنینەوە بۆ لە ماد و ساسانڕا دەست پێ نەکەین؟ زانایەک ناوەکەیم لە یاد چۆوەتەوە دەڵێت: (هەر نەتەوەیەک بە ڕابردووی خۆی نەزانێت داهاتووشی دیار نییە.) ئەگەر سەیری ئێستای کورد بکەیت ئەو دڕکەی لە پاینییەی ڕۆچووە و پێی دەشەڵێ دڕکی (یەکنەگرتنە)، ئەو گورزەی لە مێشکی دراوە و لە زانستی دوور دەخاتەوە (نەخوێندنە) و ئەو تایبەتمەندییەی ناهێڵێت ماڵێک بۆ خۆی دروست بکات و تێیدا وەحەسێ، (سادە و ساکاربوونە). مامۆستا هەژار دەگێڕێتەوە: منداڵێک تووشی کەسێکی میهرەبان و سەرووڕووخۆش و دڵکراوە و جوانچاک و ئازا دەبێت. منداڵە دەڵێ: تۆ کێی؟ کابرا دەڵێ: شەیتانم. دەڵێ: من وێنەکانی تۆم دیوە زۆر ناشیرنی و زۆر دڵڕەقی. شەیتان دەڵێت: جا ڕۆڵە گیان چ بکەم قەڵەمەکە بەدەست خۆیانە!. بە حەزی خۆیان دەمکێشنەوە بەس نییە هەر دەڵێن هەیە.

کورد تا ئێستا لە مێژوویدا هەر بەسەرهاتی شەیتانی بووە. هەر دەمڕاست و مێژوونووس و چڵکاوخۆری دیوەخان و دەرباران و پاشایانی بێگانە و دوژمنەکەی، مێژوویان بۆ تۆمار کردووە. میدیا و زمان و کلتوور و دەسەڵاتی بێگانە، چەواشەی کردووین. کێ هەیە شانازی بەمەوە بکات، کە کوردە. هەر دوژمنی خۆمانیان بە دۆست پێ ناساندین. ئێستاش زۆر گەنجی کورد هەیە، کە هەر ناشزانێ مانای کورد چییە؟ لە کەیەوە لەم وڵاتە گیرساوەتەوە؟ چی بەسەر هاتووە؟ چی لێ نەقەوماوە؟. تا ئێستا چی کردووە؟ زۆر کەس هەن، کە نازانن نیشتمانی کورد لە چاڵدێرانەوە دوولەت بوو. جا باشە کەسێک نەزانێ نیشتمانەکەی لە کەیەوە دوولەت بووە چۆن دەتوانێ چوار پارچەکەی وەسەر یەک بخاتەوە، چاڵدێرانیش هەر وەک زۆر شەڕی دیکەی ناو نیشتمانی کورد، شەڕێک بوو، کە دوژمنانی کورد لەسەر خاکەکەی کردیان و بێجگە لە ماڵوێرانی و کوشتن و بڕین و سوتان و تاڵان هیچ دەستکەوتێکی بۆ کورد نەبوو، ئەم باسەش زۆر خەست و خۆڵە و کورد گوتەنی ئەم هەویرە ئاو زۆر هەڵدەگرێ، بەڵام هیچ کام لە مێژوونووسانی تورک و فارس و بیانییەکانیش باسێکی ئەوتۆیان لەسەر کورد نەکردووە. خۆ کورد دەزانێ ژانی چاڵدێران چەند بە ئێش بوو؟ تاکەی نیشتمانی کورد گۆڕەپانی شەڕی دوژمنەکانی دەبێت، ئەحمەد بداغی لە شیعرێکیدا دەڵێت (مێژوو دەڵێ هەر دەگەنێ، بەڵام زۆر شل هەنگاو دەنێ) کەی کورد یەک دەگرێ و کەی خوێندەواری لێ دەردێت و کەی سادە و ساویلکە نابێت! نازانم! بەڵام ئەمە دەزانم، کە ئەمە کورد نییە خۆی بە جیهان ناساندووە، نا، نا، ئەوە دەرد و ژان و مەرگەساتە ئەمە کیمیابارانە و ئەنفال و جینۆسایدە ئەمە شەنگالە. بڵێی تا دەگەینە سەربەخۆیی چەند شەنگال و کۆبانی دیکەمان ببێتە قوربانی. بە ویرەویری ئەی رەقیب بەرەو ترۆپکی خەم و خەفەت و ئێش و برک و ژان هەنگاو دەنێین ئاڵایەکمان بەدەستەوەیە بەشکم لە شوێنێک هەڵیکەین. ئەودیوی لوتکە قەراج نییە، زۆزان و زەنویران نییە بڵێین وچان دەدەین! نا، هەڵدێرە، هەڵدێر. کورد ئەگەر لەم ساتە وەختەی خۆی ساغ نەکاتەوە و هەنگاوەکانی توندتر و

خێراتر نەکات، ئەوا لە ترۆپکی خەمەکانی، ئاوا دەبێ و هەڵدەدێڕدرێ و ئەودەم دەبێ سی هەزاساڵی دیکەش بپێوین تا بەشکم بە شتێک بگەین. دەبێ کوردیش شا سمایلێکی لێ هەڵکەوێ و هەمووومان پشتی بگرین و ببینە هێز بۆ مەچەکی و ببینە باوەڕ و ئیرادە بۆ هەنگاوی. خۆ هەر ئەم ئێرانە، پێش شا سمایل هەر پێخوستی ئەم و ئەو بووە. دەی باشە ئەی بۆ کورد ناتوانێ هەنگاو بنێت.

شا سمایل نەیدەزانی ناسیونالیزم چییە بەڵام خوڵقاندی و ئێستا لەبەری حەساونەتەوە. ئەی کەوایە ناسیونالیزمی کوردی ئەودەمی چی دەکرد و ئایا شەڕی چاڵدێران دەسپێکێک بوو بۆ میر و میرانی کورد، کە لە بیری کوردایەتیدا بن. ئەم باسە دەبێ توێژەرانی ئەم بابەتە لەسەری بدوێن.

بیری ناسیونالیزمی کورد لەمێژە سەرکردەیەکی ئازا و چالاک و وەستا و سیاسەتزانی دەوێت.

بەهیوای نیشتمانێکی سەربەخۆ

وەفا بداغی

# شەڕی چاڵدێران لە روانگەی گەشتیارە بیانییەکانەوە

د. رەمەزان محەمەدی

**پوختەی بابەت:**

دامەزرانی دەسەڵاتی سەفەوی لە مێژووی ئێراندا، لە زۆر لایەنەوە گرنگە. لەلایەکەوە، ئێران پاش چەندین سەدە لە ژێر چەپۆکی بێگانە هاتەدەر و، پاش تێپەڕاندنی مێژوویەکی پڕاوپڕ لە کێشە و شەڕوهەڵا، دەستی گەیشتە درەختی یەکیەتیی نەتەوەیی و توانیی ببێتە خاوەنی دەسەڵاتێکی ناوەندگەرای سەقامگیر و بەهێز. بە واتایەکیتر ببێتە ئێرانی و، لە ئاست ئیمپراتۆریەتی گەورەی عوسمانی بچێتە ناو ململانێیەکی دیکەوە و لەلایەکیتریشەوە لەگەڵ بە فەرمی ناساندنی ئایینی شیعە، کاریگەرییەکی رۆحی و قووڵی کردە سەر مێژوو و، گەلێک شانازی و بەهای فەرهەنگیی لە پاش خۆی بەجێ هێشت. ئەودەمەی شا سمایل بە یارمەتیی قزڵباش توانیی دەسەڵاتی ئاق قۆیونلووە تورکەمەنەکان لەناو بەرێ و، سەرجەم دەسەڵاتخوازانی دیکەش سەرکوت بکات و، هەروەها توانیی لە شەڕی "مەرو"دا شیبانی خانی ئۆزبەک تێک بشکێنێ.

لە هەمانکاتدا لەناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی پاش زنجیرە گۆڕانێک، کە بەرهەمی شەڕ و ململانێی نێوان کوڕانی سوڵتان بایەزید بوو، لە کۆتاییدا سوڵتان سەلیمی پاوانخواز و بێڕەحم پاش کوشتنی براکانی خۆی و کلاکردنی باوکی لە دەسەڵات، توانیی کورسیی دەسەڵات بۆخۆی داگیر بکات. سوڵتان سەلیم، کە کوێرەسوننەیەکی وشک بوو، هەم لەبەر وشکەمەزهەبی بوونەکەی و، هەمیش لەبەر مەترسیی سنوورەکانی رۆژهەڵاتی وڵاتەکەی، کە کەوتبووە بەر هەڕەشەی سەفەوییەکانەوە ، بۆ

لەناوبردنی دەسەڵاتە تازەپێگرتووەکەی سەفەوییەکان قۆڵی هەڵماڵی و سەرەنجام بە لەشکرێکی گران و لەبننەهاتوو بەرەنگاری شا سمایل و قزڵباشان بووەوە. دوو لەشکر لە دەیەمی رەجەب/ بیست و دووی ئابیساڵی ٩٣٠ک.م/١٥١٤ز لە دەشتی چاڵدێران* لە دەوروبەری شاری خۆی(خوێ) بەرەنگاری یەک بوونەوە.

پێداگریی پیاوماقوڵ و فەرماندەکانی لەشکری ئێران بووە هۆی پاشەکشێی ئێران لە شەڕدا. ئەم شەڕە لە زۆر سەرچاوە و بەڵگەنامەی ئێراندا بە تێروتەسەلی باسی لێ کراوە. سەرەڕای ئەوەش لە سەفەرنامە بیانییەکاندا وەکوو سەفەرنامەی ڤێنیزییەکان زۆر کەوتووەتە بەرباس و لەسەری دواون.

---

* دەشتی چاڵدێران نزیکەی ٨٠ کیلۆمەتری دووجایە و بیست فەرسەخ لە تەورێزەوە دوورە و لە باکووری رۆژئاوای شاری خۆی(خوێ) هەڵکەوتووە. ئەم شەڕە هەم بۆ ئێرانییەکان و هەمیش بۆ دەوڵەتی سەفەوی یەکجار گرنگ بوو. سەرەڕای ئەمەش دەوڵەتانی ئەورووپاش زۆر بە وردی دەرەنجامی شەڕەکەیان خستبووە ژێر چاوەدێرییەوە چونکە ئەگەر ئێران سەرکەوتبا، مەترسیی عوسمانییەکان بۆ دەوڵەتانی ئەورووپا دەسڕایەوە. ئەگەریش عوسمانییەکان سەرکەوتبان ئەوا ئەورووپاییەکان دەکەوتنە بەر هەڕەشەی جیدییەوە. کەوایە بەم تێگەیشتنەڕا چاودێرانی دەرەوە زۆر بە حەزەرەوە لە پەنا مەیدانی شەڕ دەیانڕوانییە شەڕی چاڵدێران. هەر بۆیە لەناو سەفەرنامەکانی خۆیاندا بە وردی راپۆرتی تێروتەسەلیان لەسەری نووسیوە؛ ئەگەرچی هەندێکجار تووشی هەڵە بوونە بۆ وێنە: لە راپۆرتەکانی مێژوونووسان کاترنیۆزێنۆ و ئانجیلۆدا  نووسراوە، شا سمایل لە شەڕەکەدا نەبووە. لە حاڵێکدا، بە پێچەوانە و، بە پێی سەرچاوە ئێرانییەکان و بەڵگە مێژووییەکان تەنانەت دەڵێن شا سمایل خۆیشی لە شەڕەکەدا بووە و تا کۆتایی شەڕەکە زۆر بوێرانە شمشێری وەشاندووە. سوڵتان سەلیم پاش سەرکەوتنی لە شەڕەکەدا هەڵیکوتایە سەر تەورێز و داگیری کرد و بەڵام پاش چەند رۆژ لەبەر مەترسی و هەڕەشەی قزڵباشان و تەنینەوەی دەنگی ناڕەزایەتی و راپەڕینی یەنی چرییەکان بەناچاری تەورێزی چۆڵ کرد.

## پێشەکی:

سەرچاوە و ژێدەری مێژووی سەردەمی سەفەوی بە هەموو جۆرێک و بە هەر قەڵەمێک نووسراوە و ئەمەش یەک لە تایبەتمەندییەکانییەتی. ئەم ژێردەرانە، کتێبی مێژوو و دەقی جوگرافیایی و ژیاننامە و گرنگتر لە هەمووان ئەو سەفەرنامانەن وا لەو دەورانەدا نووسراون، بێ لە کتێبی مێژوو، سەرچاوەکانی دی یەکجار گرنگن، چونکە ئەو نووسەرانە زۆرتر تیشکیان خستۆتە سەر بابەتی کۆمەڵایەتی و دارایی، کە لە راستیدا نووسەر و قەڵەمبەدەستانی ئێرانی کەمتر ئاوڕیان لێ داوەتەوە. خۆی ئەم جۆرە ژێدەرانە تەواوکەری ئەو سەرچاوە مێژووییە ئێرانیانەن، کە لایەنی سیاسیی مێژووکەیان لەبەرچاو گرتووە.

ئەو سەفەرنامانە زۆرتریان، وەکیل و دەمڕاستی کاروباری سیاسی و بازرگانی و گەشتیاری و بانگەشەکارانی ئایینی نوسیوویانن و، هەرکام لەوانەش بە سەرنجدان بە ویست و ئامانجی تایبەتی خۆی، ئەوەی چاو و گوێیان و باڵیان بۆ کێشاوە، قەڵەمیان بۆ وەکارخستووە و لە چاپیان داوە. ئەم تیپ و قوماشە لە گەشتیارانی وڵاتان هەندێکجار لەبەر ئەوەی داب‌ونەریت و فەرهەنگ و کلتووری نەتەوەکانیان بە جوانیی نەناسیووە و دەرەنجامی خراپ و نەشیاویان بۆ لێک داوەتەوە و، هەندێکجاریش جەوهەری رق و کین بووەتە دەمڕاستی قەڵەمەکەیان و بابەتی نابەجێ و نادروستیان خستۆتە سەر کتێب، یان ئەوەی، کە پاش چەندین ساڵ لە گەڕانەوەی سەفەریان. دەستیان داوەتە قەڵەم و لە شیکردنەوەی رووداو و رەوت و رەواڵی سیاسی، کۆمەڵایەتی تووشی هەڵە بوونەتەوە. ئەمما بەو

هەمووە کەموکوڕییەشەوە، ئێستاش ئەم ژێدەرانە خاڵی زۆر بەهێزیان تێدا بەرچاو دەکەوێ. چونکە زۆر لەو نووسەرانە گوێیان نەداوەتە لەمپەرە سیاسیەکان و زۆر لەو راستیانە، ، کە قەڵەمی نووسەرانی ئێرانی بەتایبەت لەسەر کارکردی کاربەدەستانی حوکمەت سەرپۆشیان بەسەردا داوە، بەوردی و بە بۆچوونێکی وردبینانەوە بابەتە جۆراوجۆرەکانیان خستۆتە بەرباس و توێژەری ئەمڕۆ لەناوئاخنی ئەم کتێبانەدا چاوی بە زۆر بابەتی ئیداری، دارایی و فەرهەنگی و کلتووری (داب‌ونەریت) دەکەوێ. بۆ سوودوەرگرتن لە سەفەرنامەکان بۆ توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی مێژوویی دەبێ بە وردی ناوەڕۆکەکەیان هەڵسەنگێندرێ و بە چاوی رەخنەوە لێیان بڕوانی و بۆ ئەوەی درۆ و راست مەعلووم بێت خۆ ماندوو بکەی. چونکە بابەتی ئەم وتارە (شەڕی چاڵدێران لە روانگەی سەفەرنامە ئەوروپاییەکان)ەوەیە، هەر بۆیە هەوڵ دراوە لەگەڵ ئەوەی ئەو رووداوە گرنگەی مێژووی ئێران لە سەردەمی سەفەویدا لە روانگەی گەڕۆکە قەڵەم بەدەستەکانەوە دەگێڕینەوە، بۆ وەدرۆخستنەوە و پشتڕاستکردنەوەی نووسراوەکانیان لەسەر بابەتەکە، هەندێکجار سەرچاوە و کتێب و نووسراوەی نووسەرانی ئێرانیش بخەینە بەرچاو. بەتایبەت چونکە زۆر لە نووسەرانی ئەو سەفەرنامانە پاش شەڕی چاڵدێران و دوای دەسەڵاتی شا سمایلی سەفەوی هاتوونەتە وڵاتی ئێران و بوونە چاودێر و شایەتی رووداوەکان. هەربۆیە یان هەر باسی شەڕی چاڵدێرانیان نەکردووە یان بە ئاستەم قەڵەمەکەیان بە پەنایدا تێپەڕیوە. لەنێو نووسەرە بیانییەکاندا، کە لە جەرگەی شەڕەکە دابوون و بە باشی و بە جوانی لەسەری دواون دەکرێ ئاماژە بە قەڵەمە راستبێژ و بە بایەخەکەی ڤێنیزییەکان بکەین، کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا یەکجار سوودی لێ وەرگیراوە. هەڵبەت گەرچی ئەم نووسەرانەش هەندێکجار هەڵە و پەڵەیان بووە بۆ وێنە هەم کاترینۆزێنۆ هەمیش ئانجیلۆ رایان وایە، کە شا سمایل لە تەورێز سەرقاڵی کۆکردنەوەی هێز و لەشکر بووە. کەچی بە وتەی زۆر ژێدەری ئێرانی و تورک شا سمایل خوێشی لە گۆڕەپانی شەڕەکەدا بووە و زۆریش ئازایانە بەرەنگاری

سوپای عوسمانی بووەتەوە. یان بۆ بەدیلگیران و کوژرانی خان محەمەدی ئوستاجلو و سارۆپیرە بەدەستی سوپای عوسمانی هەمیسان تووشی هەڵە بوونەتەوە. تەماشا دەکەی بەپێی وتەی ژێدەرە مێژووییە ئێرانییەکان، کەسێک بە ناوی سوڵتان عەلی ئەفشار، کە رواڵەت و قەد و قەڵافەتی لە شا سمایل چووە، بۆ نەجاتدانی گیانی شا سمایل لە جیات شا خۆی بە دەستەوە داوە.

کۆمەڵەی سەفەرنامەی ڤێنیزییەکان لە ئێراندا، شەش سەفەرنامەن، کە پێنجیان، چوار باڵوێزی وێنیرییا و ئەوی تریشیان، بازرگانێکی بێناونیشانی وڵاتی ڤێنیزییا نووسیویەتی. ئەم پێنج کەسە لە دەورانی دەسەڵاتەکەیی ئۆزۆن حەسەن، -ئاق قۆیونلو- و شا تەهماسوبی یەکەمی سەفەوی پێیان ناوەتە ئێران و تایبەت بۆ ئەوە راسپێراون بۆ شەڕی عوسمانی، ئێران هان بدەن. لەو نێوەدا، سەفەرنامەکەی کاترینۆ زێنۆ بە شێوەیەکی زیندوو و تاڕادەیەکیش بە وردی باسی شەڕی چاڵدێرانی کردووە. ئەوی تریشیان ئەنجێلۆ ڤێنیزیاییەکەیە، کە خۆی شایەتی شەڕەکە بووە و تاڕادەیەکیش بە تێروتەسەلی باسی لێ دەکا.

سەفەرنامەکەی دالساندری سەرەڕای ئەوەی بابەتێکی زۆر بەبایەخی سەبارەت بە چۆنیەتیی بەدەسەڵاتگەیشتنی شا سمایل و شەڕەکانی شا سمایل لەگەڵ میرانی ئاق قۆیونلو و شەڕوانشایان و تاجلەسەرنان و بارودۆخی ئیداری، جوگرافیایی و دابونەریتی خەڵکی ئێران هێناوەتە بەر باس، مخابن سەبارەت بە شەڕی چاڵدێران کەمتر دواوە. سەفەرنامە ئەوروپاییەکانی دیکە وەکو، سەفەرنامەکەی پیتیر دلاوالە، تاورنیە، شاردێن سانسۆن، ئەلئاریۆس و کەمپرفر و ئەوانیتر یان هەر باسیان لە شەڕی چاڵدێران نەکردووە یان هەندێکیان وەکو تاورنیە و دالساندری و شاردێن بە ئاستەم ئاماژەیەکیان پێ کردووە. ئەم لێکۆڵینەوەیە، شەڕە گەورە و نیشتمانییەکەی چاڵدان لە روانگەی نووسەرانی بیانی و ئێرانییەوە دەخاتە بەرباس و لێکۆڵینەوە و بەراورد.

سەردەمی سەفەوی لە سەردەمانی ئیسلامیشدا سەردەمێکی پڕشنگدارە لە مێژووی ئێران. ئەو سەردەمەی کاریگەرییەکی قووڵ و سەرسووڕهێنەری لەسەر ژیانی رۆحی، بەها و بایەخە فەرهەنگییەکانی وڵاتی ئێراندا بووە. ساڵی ٩٠٦-٩٠٧ ک. ئەو دەمەی شا سمایلی سەفەوی ئاق قۆیونلووەکانی تێک شکاند و پاشان گەیشتە تەورێز - پایتەختی تورکمان[١] - و کورسیی دەسەڵاتی کەوتە دەست، دەسەڵاتێکی دامەزراند، کە تا ساڵی ١١٤٨ ک.م ژیا. دەرکەوتنی حوکمەتی سەفەوی بەڕاستی، خاڵێکی وەرچەخانە لە مێژووی ئێراندا. لە راستیشدا سەردەمێکی نوی لە مێژووی ئێران دەستی پێکردبوو، کە دەسکەوتەکانی ئەو سەردەمە، دامەزرانی دەسەڵاتێکی بەهێز و بەتوانا بوو پاش چەندین سەدە لە بندەستبوونی بێگانە بوو. هەروەها پاش سەردەمانێک شەڕ و ئاژاوە و ئاڵۆزی و ناسەقامگیری سیاسی ئەزموونێکی تر بوو بۆ ئارامی و هێمنایەتی. دامەزرێنەری زنجیرە حوکمەتی سەفەوی، کوڕی شێخ حەیدەر کە نەوە و تۆرەمەی شێخ سەفیەدینی هەردەوێلی بوو. ئەو کوڕێکی زۆر سەروروخۆش بوو و هەڵسووکەوتێکی شاهانەی بوو.

پیاوێکی نوورانی و بەکەماڵ بوو، ئەوەندە بە کەرامات و بە زەین بوو سەری لە ئاسمانان دەسوی.[٢] لە کێبەرکێی تیرهاوێشتن، لەو ١٠ سێوەی بۆ نیشانە داکرابوون، حەوتیانی پێکا، [٣] پاش ئەوەی گەیشتە تەورێز، ئایینی شیعەی کردە ئایینی دەسەڵات. راگەیاندنی شیعەی دوازدەئیمامە لە ساڵی ٩٠٧ ک. وەکو ئایینی فەرمی دەسەڵاتە تازەپێگرتووەکەی سەفەوی، کە هێشتا بنج و ریشەی دانەکوتابوو، کارێکی گەورە و مەترسیدار بوو. ئاخر ئەودەمی نەیارانی ناوخۆ و دەرەوەی وڵات چاوی تەماحیان بڕیبووە حوکمەتە پێرۆکەکەی سەفەوی. خۆی شا سمایل بەو کارەی دین و

---

(١) ترکمان اسکندربیگ، عالم آرای عباسی، ص٣٨، سفرنامەی آنجوللو، ص٣١٢.

(٢) سەفەرنامەی کاترینو زنو، ص٣٤٦؟

(٣) سەفەرنامەی انجوللو، ص٣١٧-٣١٧.

حوکمەتی لێک دان و، یەکیان گرت و بوو بە راستییەکی حاشاهەڵنەگر. دوو سەدە بانگەشەی خانەدانی سەفەوی بۆ پەرەپێدانی شیعە وەکو ئایینی فەرمی، هێند کارێکی گەورە و مەترسیدار بوو، کە تەنانەت هەندێک لە راوێژکارانی شا دەترسان کاردانەوە و دواهاتی خراپی لێ بکەوێتەوە. چونکە هەر لەو تەورێزەی پایتەختی حوکمەتی سەفەوی دوو بەشی خەڵکی هێشتاش هەر سوونە بوون. جاڕدانی فەرمیبوونی شیعە ئەوەندەش لەبەر چاوان سووک و سادە نەبوو. ئاستی توندوتیژی و توندئاژۆیی لە حاست سوونەدا کاردانەوەی بە شوێندا بوو، تا وای لێهات سەرەڕای گرتن و لێدان و کوشتن و بڕین و سووتاندن شا ناچار کرا، کە بۆ داخوازی پێشەوایانی سوونە مەزهەب سەبارەت بە نەخوێندنەوەی (اشهد ان علی ولی الله) لە نوێژدا خواستەکەیان لەبەرچاو نەگرێ و گوتی: (من راسپێردراوی ئەم ئەرکەم و لە کەسیش ناترسم لەو خودایەم دەوێ خەڵک لە بزیان لە بزم بگەڕێ و لە نوێژدا ناوی عەلی نەهێنن. دەنا ناچار شمشێر هەڵدەکێشم و تاقتان نانی زیندووان ناخۆن. [١]بەڕای سیوری شا سمایل بەم کارەی، یەکەم: هێز و پێزی ئایدیۆلۆژیایەکی چالاک و بەتوانای خستە پێناو دەسەڵاتەوە و بەم جۆرە ئەو هێزەی دەدا بە حوکمەت، کە بەسەر یەکەم کێشەکانیدا زاڵ بێت، دووەمیان ئەم کارە حوکمەتی سەفەوی و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی -کە هێزی گەورەی جیهانی ئیسلام بوو لە سەدەی دەیەم- بە ئاشکرا لێک هەڵاوارد. بەم پێیە پێناسەیەکی سیاسی بە حوکمەتەکەی دا و سنوورێکی بۆ دەستنیشان کرد. هەڵبەت دەکری ئەمەش بۆ بەڵگە بهێنینەوە، کە دامەزرانی حوکمەتێکی ئازا و بوێری شیعە لە پەنا دەستی هۆزەکانی عوسمانی خۆی لە خۆیدا دۆخەکەی ئاڵۆزتر دەکرد و لەگەڵ عوسمانییەکان کە دوژمنی ئێران بوون شەڕ و ململانێی لێ دەکەوتەوە، بەڵام چ ئایینی سەفەوی سەرکەوتبا و چ شکستی هێنابا رەنگە ئێران لە سەدەی دەیەمدا بکەوتبا بەر هەڕەشەی عوسمانی، کە بۆ

(١) خواندمیر، حبیب الیسر، ج٤، ص٤٦٨.

بەرینکردنەوەی دەسەڵاتی خۆی لە هیچ شتێک سڵەی نەدەکرد. سەرکەوتنی ئایینی سەفەوی لانیکەم بۆ حوکمەتی سەفەوی ئەم ئیقباڵەی بەدوادا هات، کە لە ئاست زەبەلاحترین حوکماتی دنیای ئیسلام تاقەت بێنێت و بەچۆک دانەدا. [1] لەولاشەوە، دەسەڵاتی عوسمانی، کە گەشتیارە ڤێنیزییاییەکان بە (تورکە گەورە[2] ناویان دەبرد، تابشتی دەسەڵاتێکی شیعەی و تۆکمە و یەکپارچە و بەهێزی لە بەری رۆژهەڵاتی نەبوو، چونکە هەم بە تەمای بەرینکردنەوەی سنوورەکانی لای رۆژهەڵاتی بوو، کە دەسەڵاتی زلهێزی سەفەوی ببوە لەمپەر و هەمیش لە شەڕی ئۆزۆن حەسەنی ئاق قۆینلو ئەزموونی شەڕ و هەڵسووکەوتی ئەوروپاییەکانی هاتبووە دەست، کە دوژمن و نەیاری هەرە گەورەی عوسمانی بوون. [3]سمایل هەموو هێزی بۆ دەسەڵات خستبووە گەڕ و هەوساری کورسیی دەسەڵاتی زۆر چاک لە چنگی قایم کردبوو و زۆر چاکیشی دەزانی ئەگەر بێتوو لە ئاناتۆلیا، لەباری سەربازییەوە بکەوێتە مەترسی و قزڵباشەکانی ئاناتۆلیای لی هەڵگەڕێتەوە ئەوا دەستبەجی دەسەڵاتەکەی دەکەوێتە مەترسییەوە. [4]بۆ وێنە شا سمایل

---

(١) سیوری، راجر، ایدان عصر منوی، صص ٢٦ و ٢٧.

(٢) سفرنامه کاترمیوزیو، سفرنامه انجوللو، صفحات مختلف.

(٣) کەوتنی قۆستەنتەنیە بە دەست سوڵتان محەمەدی فاتیح، دەسەلاتی عوسمانی، وەکو دوژمنێکی مترسیداری ئەورووپاییەکانی زەق کردەوە. ئەورووپاییەکان کە لە دەسەلاتە بەهێزەکەی عوسمانی زۆر دەترسان، سەرەڕای یەکگرتنیان هەوڵیان دا خۆیان لە ئۆزۆن حەسەن پاشا بەهێزەکەی ئاق قۆیونلو نزیک بکەنەوە. بە یەکگرتنیان لەگەڵ هێزێکی رۆژهەڵاتی سنوورەکانی رۆژهەڵاتی عوسمانی تێک بدەن و پەکی پێشڕەویی هێزی عوسمانی لە سنوورەکانی رۆژئاوا بخەن. بەلام لەگەڵ تێکشکانی ئۆزۆن حەسەن لە ترۆجان ئەم خەونەیان نەهاتە دی. بۆ ئەو بابەتە لاپەڕەکانی ٢٢٤ و ٢٢٩ سەفەرنامەکەی کاترینۆ زینۆ و، لاپەڕەکانی ٢٣٠ و ٢٢٩ سەفەرنامەکەی ئانجێلو، چاو لێ بکەن.

(٤) سومێر، فاروق، نقش ترکان آناتولی در تشکیل دولت صفوی، ص٢٤. شیاوی باسە زۆر لە مریدانی خانەدانی سەفەوی لە سەردەمی خواجە عەلی رابەری رێبازی سەفەوی

جارێکیان سنوورەکانی عوسمانیی بەزاند و خۆی گەیاندە توقات، دەسەڵاتی ئەوکات سەبارەت بەوەی زۆر بی چاوڕوویانە سنووری بەزاندووە پرسیاری لە شا سمایل کرد و شا سمایل بەو جۆرە وڵامی داوە: (سوڵتان وەکو باوکی منە و من تەماح ناکەمە وڵاتەکەی و ئینجا بە بیانوویتر، دەستبەجی پێی نایە ئەلبستان.[١])

سوڵتان بایەزیدی عوسمانی بە وردی گشت چالاکییەکانی حکوماتی سەفەوییەی لە ئێراندا، خستبووە ژێر چاودێری و سەبارەت بە سەرکەوتنەکانی شا سمایل بەسەر ئاق قۆیونلو و شەڕوانشایاندا و سەرجەم سەرکەوتنەکانی دیکە ترسی لێ نیشتبوو و بۆ ئەوەی لە بنج و بناوانی دەسەڵاتە تازەپێگرتووەکەی سەفەوی و هێز و توانای راستەقینەی شا سمایل سەر دەرێنی، هەندێ نامەی بۆ میر و خانانی سەر سنوورەکانی ئێران و عوسمانی نارد و داوای زانیاری زیاتری لێ کردن، بۆ وێنە هەر ئەو ساڵە نامەیەکی بۆ حاجی رۆستەم بەگی موکری نووسی، داوای لێ کرد لەسەر سەفەوییەکان بکۆڵێتەوە و بیگەیەنێتە دەست عوسمانی. ئەویش پاش ماوەیەک وڵامی ناردەوە بۆ بایەزید، کە بەسەرهاتی ئەم عەشیرەتە خودا غەزەب لێگیراوە ئێستا ئاوایە وا هەڵیانکوتاوەتە سەر ئەلوەند خان -میرێکی ئاق قۆینلو- و پەلاماریان داوە و لەوێڕا بەرەو عێراقی عەجەم ئەسپیان تاو داوە و مراد خانیانیان -میرێکی تر لە ئاق قۆیونلو- تەفروتونا کردووە و لە عێراقی عەرەبیش باریک پرناک لە ترسان ئاشبەتاڵی کردووە و ئێستا ئەو یاخییانە لەگەڵ قولەکانی میسر واتە چەرکەسەکان سازاون و یەکیان گرتووە، ئێستاش بەرە و دیاربەکر و مەرعەش دەئاژوێن ... .) سوڵتان بایەزید چاری نەبوو بۆ پادشای سەفەوی دەرگای ئاشتی لەسەر گازەرای پشت کردەوە و ساڵی ٩١٠ک.م. باڵوێزێکی بە ناوی محەمەد چاوش بالابان

---

لە ئاناتۆلیا دەژیان و لە راستیدا مەکۆی قزڵباشان واتە داشی دەسەلاتی سەفەوی ئاناتۆلیا بوون.

(١) اوزون چاوشلی، تاريخ امپراطوری عوسمانی، ج٢، ص٢٤٥.

به دیاری و سەوقاتی گرانباوە ناردە دەرباری ئێران و پیرۆزبایی سەرکەوتنەکانی عێراق و وڵاتی فارسی لێ کرد.[1]

ساڵی ٩١٦ک.م. دوو ڕووداوی گرنگ قەوما:

١- تێکشکان و کوژرانی شیبەک خانی ئۆزبەک بە دەستی شا سمایل.

٢- شۆڕشی بەرینی شیعەکان ساڵی ٩١٧ لە تیکەی کەناری دەریای سپیی ناوەڕاست لە ئاسیای بچووک.

خەڵکی تیکە هەر لە قەدیمەوە زۆریان ڕێز بۆ خانەدانی سەفەوی دادەنا. فەرمانڕەوایی بابا شا قولیانی پێشەوای سۆفییەکانیان بە دەرفەت زانی و دەستیان دایە ڕاپەڕین. حاکمی ئاناتۆلیش، کە ڕاسپێراوی سەرکوتکردنی شۆڕشەکە بوو هەر بەدەستی ئەوان کوژرا. دواتر وەزعەکە تەواو گۆڕا. ئاگری ئەم شۆڕشە لەگەڵ شەڕی سیواس و مردنی شاقولی بابا کوژایەوە. بە پێچەوانە چی وای پێنەچوو لە ئەیالەتی ڕۆم جارێکی تر شۆڕش سەری هەڵدایەوە، لێرە پێوەندیی نێوان شۆڕشگێڕان و سەفەوییەکان بە عالەم ڕوون و ئاشکرا بوو. هاوسنووربوونی دەسەڵاتەکەی سەفەوی لەگەڵ ئیمپراتۆری عوسمانی ئەم هەلەی بۆ خەباتکاران هێنایە دی، کە بەرەو وڵاتی سەفەوی رابکەن و پلانێکی دیکە داڕێژن. قزڵباشە شۆڕشگێڕەکان خوێشیان تەنانەت هەندێکیان ئەندامانی دەسەڵاتیش بوون و داشداری قزڵباشە خەباتکارەکان بوون. ئەو نەزمە یارمەتئیی شازادە شاهین شای کوڕی بایەزید دەسەڵاتداری قەرامان و ئەحمەدی برایان دا و هەر ئەمەش وەزعەکەی ئاڵۆزتر دەکرد. ئاڵۆزیی بارودۆخەکە پاش ئەم گۆڕانکارییانە، بوو بەهۆکاری خۆکلاکردنی سوڵتان بایەزید لە کورسیی دەسەڵات، کە ئەمەش گوشار و دەستی نهێنیی فەرماندە سەربازییەکانی لەگەڵ بوو، کە بە قازانجی کوڕەکەی واتە سەلیم بڕیاریان دەدا و سەلیم ٧ی سەفەرە مانگی ٩٨ک.م. کورسیی دەسەڵاتی داگیرکرد. ئەم سوڵتانە تازەکارە لە نەیارانی

---

(١) حسنی، نصرالله، جنگ میهنی ایرانیان در چالدران، ص١٧-١٨.

سەرسەخت و داخلەدڵی سمایل بوو.[1] ئەو هەر ئەوەندە دەستی گەیشتە دەسەڵات، دژبەر و خوازیارانی دەسەڵاتی لەناو برد. هەردووک براکانی واتە ئەحمەد و قورقودی کوشت و لەم ئەسنایەدا تەنیا سوڵتان مرادی براچکۆڵە توانیی بەرەو ئێران خۆی دەرباز بکا. سەلیم لەگەڵ ئەوەی لەناو ئیمپراتۆرییەکەی ئەستوندەکی دەسەڵاتی قایم دەکرد سەرقاڵی کاروباری دەرەوەی وڵاتەکەشی بوو.

سەرکەوتنە یەک لە دوای یەکەکانی لە ئەوروپا، بابەتی مەمالیکی میسر و راپەڕینی ئاسیای بچووک و دەسەڵاتی شیعە مەزهەبی سەفەوی سێ- چوکڵەی کێشەکان بوون، کە سوڵتانی عوسمانی لەگەڵیان لە ململانێدا بوو. کۆتاییهێنان بە شۆڕش و راپەڕینی ئاناتۆلیا و خۆنواندنەکانی هێزی دەسەڵاتەکەی سەفەوی بوو بە کوانووی سەرنجی سوڵتان سەلیم. سەلیم ئاگای لەوە بوو، کە مەترسیی هەرە گەورەی ئیمپراتۆرییەکەی، قزڵباشەکانن. ئەمەشی دەزانی، کە لانیکەم تا لە ئەیالەتی ئاسیای بچووک راپەڕینی قزڵباشان بنەبڕ نەکری، ئەوا دەسەڵاتی عوسمانی هەڕەشەی لەسەرە. کاتێک سەلیم رۆنیشتە کورسیی دەسەڵات ئەوەندە نەحەسایەوە. بە پێچەوانەی شێوەی بیرکردنەوەی ئەستەمبوڵ بۆ دەستتێوەردانی ئێران لە سەردەمی هێرشی سمایلدا بۆ سەر ئەرزەنجان ساڵی ٩٠٥ک.م/١٥٠٠ز. و بۆ سەر ئەلبستان لە ساڵی ٩١٣ک.م/ ١٥٠٧زدا، سەرەنجام مێژوویەکی تری خوڵقاند[2]، هەڵبەت نەک شا سمایل خۆی، بەڵکوو ئەوە داشەکەی شا سمایل لە ئەرزەنجان واتە نوور عەلی خەلیفە بوو، کە بە فەرمانی شا سمایل پەلاماری دایە وڵاتانی باکوور بۆ ئەوەی یارمەتی بگەیەنێتە راپەڕیوانی رۆمی. نوور عەلی خەلیفە چەندین شاری تاڵان کرد و سەرەنجام لەگەڵ فەرماندەیەکی عوسمانی واتە سەنان پاشا تێک کەوت و سەنانی زۆر پیس

---

(١) وحید قزوینی، میرزا احمد تاهر، تاریخ جهان آرای عباسی، ص١٣٦، عالم آرای عباسی، ص٤١.

(٢) تاریخ ایران، دوره صفویه پژوهش کمبریج، ص٤١.

تێک شکاند.[١] سوڵتان سەلیم یەکەم جار فەرمانی سەرکوتی قزڵباشانی ئاناتۆلی دا. هەر کەس ئەندامی بزووتنەوەکە یان گومانلێکراو بووایە و تۆمەتی پێوەندیی لەگەڵ سەفەوییەکانی خرابایە پاڵ. ئەوا ناویان تۆمار دەکرد و هەر بەم پێیە جەماوەرێکی زۆر کوژران و هەندێکیشیان کەوتنە کونجی زیندانەوە، خۆی هۆکاری ئەو ئازار و ئەزیێت و راوەدوونانە، راپەڕینە یەک لە دوای یەکەکانی قزڵباشان و پێوەندیی راپەڕیوان لەگەڵ سەفەوی بوو، نەک بیری شیعەی راپەڕیوان. پاش ئەم زنجیرە هەنگاوە، سوڵتان سەلیم بۆ پەلاماردانی ئێران خۆی تەیار کرد. بۆ ئەم شەڕە دوو هۆکار بوونە هۆی دنەدانی سوڵتانی عوسمانی: یەکەمیان هۆکاری سیاسی و ئایینی و ئەویتریشیان هۆکاری سەربازی و پێویستیی سەقامگیربوونی باری ئەمنی لە بەرەی رۆژهەڵاتی ئیمپراتۆرییەکەی بوو. گەرچی هۆکاری کۆمەڵایەتی و سەربازی بەسەر هۆکاری ئایینیدا زاڵ بوو، چونکە لەلایەکەوە لە ئاناتۆڵیا هۆز و عەشیرەتی لاگری سەفەوی بۆیان نەبوو لە وڵاتی عوسمانیدا زیاتر لەوە پەرە بستێنن و نەشیاندەتوانی بچنە ناو کۆمەڵگای عوسمانییەوە، بەڵام بەپێچەوانە بە لاگری و یارمەتیدانی ئەو سەفەوییانەی تازە پێیان نابووە رێبازی سەفەوییەوە ، مەجالی پێشکەوتنیان بۆ دەرەخسا. لەلایەکی تریشەوە سەفەوییەکان هەوای بەرینکردنەوەی سنوورەکانی بەرەی خۆرئاوایان لەسەردا بوو و، هەر بەم جۆرەش هێمنایەتی و ئارامیی سنوورەکانی رۆژهەڵاتی عوسمانی دەکەوتنە بەر هەڕەشە. لەو لاشەوە سوڵتان سەلیم کەسێکی پاوانخواز و وشک و داخ لەدڵ و نەترس و کەللەڕەق بوو تەنانەت گەشتیارێکی ڤێنیزی ئاوای باس دەکا: (سەلیم خوێنخۆرترین کەسی زەمان بوو و، بەس بیری لە شەڕ و بەرینکردنەوەی دەسەڵاتەکەی دەکردەوە).[٢]

---

(١) تاریخ جهان آرای عباسی، ص١٧٨.

(٢) نقل از جنگ میهنی ایرانیان در چالدران، ص٣٦.

له ئاییندا سوننەیەکی وشک مەزهەب و لە سیاسەتیشدا بێبەزە بوو، بەڵام خۆ شا سمایلیش هێندە لەو ماقوڵتر نەبوو. بازرگانێکی ڤێنیزیش بەم جۆرە باسی شا سمایل دەکا، کە خۆی سەلمێنەری خۆشەویستی شا لە نێوان خەڵک و سەربازەکانیدایە: (شەڕکەرانی شا، کە زۆریان بە بێ خودە و زرێ دەچنە گۆڕەپانی شەڕەوە و چاوەڕوانی ئەوەن، کە سمایل لە شەڕدا بیانپارێزی. هەروەها هەندێک شەڕکەر هەن، کە زرێ و کلاوخود ناپۆشن هەر وا دەچنە شەڕ و بەوەش رازین، کە لە ڕێی پاشای خۆیاندا گیانیان بەخت کەن. هەربۆیە بە سینگی رووتەوە هەڵمەت دەبەن و هاوار دەکەن (یا شێخ، یا شێخ) .[1]

سوڵتان سەلیم بەر لەوەی لەگەڵ شا سمایل بەشەڕ بیت، دەستی دایە هاندانی شێخ و پێشەوای ئایینی سوننە و فتوای دژی شا سمایل. لە فتوای هەمزە سارگوزر و کەمال پاشازادە بەر لە شەڕی چاڵدێران باسی کافر بوون و بەلاڕێداچوونی قزڵباشان دەکرێت. وەک چۆن سارگوزر لە فتواکەیدا ڕێگەی کوشتنی شا و مریدانی بەم جۆرە خۆش دەکات و دەڵێت: (بەتایبەت ئەم عەشیرەتە، کە کافر و بەلاڕێداچووی ڕێبازی ئیسلامن و بەگشتی ڕێگەی خراپەیان گرتووەتە بەر، کوشتنیان لەسەر هەموومان واجبە).[2] بێجگە لەم بەڵگانەش، کە باسمان کرد سەلیم داخی شا سمایلی هەر لە دڵدا بوو و هەردەم بیری لە تۆڵە دەکردەوە. چونکە پاش ئەوەی جێی باوکی گرتەوە، گشت حاکم و دەسەڵاتدارانی وڵات پیرۆزباییان لێ کرد بێ لە شا سمایل. شا سمایل نەک هەر پیرۆزبایی لێ نەکرد، بەڵکو سەرەڕای ئەوەش پاش مردنی سوڵتان بایەزید، ئەحمەدی برای سوڵتان سەلیمیشد داڵدە دا. تەنانەت سوڵتان مرادی برای چکۆڵەی سوڵتان سەلیمیشی هێنایە ژێر باڵی خۆی و ئەم ئاکارانەی شا سمایل لە بەرامبەر

---

(١) سفرنامه بازرگانان ونیزی، صص٤٢٨-٤٢٩.

(٢) صفت گل، منصور، نقل از ساختار نهاد و اندیشه دینی در ایران عصر صفوی، ص٥٨٧.

سوڵتان سەلیم تۆوی رق و قینی زیاتر لە دڵی سەلیم داچاند و ئیتر سەلیم داخیکی گرانی لێ هەڵگرتبوو.[1]

لە سەفەرنامەکەی ئانجیلۆدا هاندان و دنەدانی هەندێک لە میر و سەرۆکهۆزی دەوراندەری سنوورەکانی ئێران و عوسمانی کە باجدەری دەسەڵاتی سەفەوی بوون وەکوو یەکەم هۆکاری دەزانن بۆ هێرشەکەی سوڵتان سەلیم بۆ سەر ئێران: (تاقمێک لە ئێرانییەکان بەتایبەت کوردەکان، کە دوژمن و نەیاری شای سەفەوی (سمایل) بوو، سوڵتان سەلیمیان دنە دەدا، کە هێرش بکاتە سەر ئێران و بەڵێنی یارمەتیان بە سوڵتان سەلیم دا، چونکە شا سەفەوی ئەودەمیش سەرقاڵی شەڕی تەتەرەکان بوو، هەربۆیە سوڵتان سەلیم ئەم هەلەی بە دەرفەت زانی و بەرەو ئێران رێی گرتەبەر.)[2]

لێرەدا هەوڵ دەدەین باسی چۆنیەتی ئاژوانی لەشکر سوڵتانی عوسمانی بۆ شەڕی ئێران بکەین و مێژووی ئەم رۆژە هەر لە گزنگی بەیانییەوە تا تاریکان لە زمان سەفەرنامەی ڤێنیزییەکانەوە، کە لە جەرگەی شەڕەکەدا بوون بخوێنینەوە. ئەوان خۆیان بەڵگە و شایەتی زیندووی رووداوەکە بوون و، زۆر بە جوانی وەسفی شەڕەکەیان کردووە.

سوپای عوسمانی لە قوستەنتەنیەوە وەڕێ کەوت و لە ئاماسیە توێشووی شەڕی دابین کرد و، توورەکەی دەغڵ و دانی بۆ سەفەرەکەی هەڵدروو و، خۆی بۆ شەڕ تەیار کرد و، بەرەو توقات ئاژوا.[3] لە زمان ئانجیلۆوە وەڕێکەوتنی سوڵتان سەلیم لە قوستەنتەنیەڕا ساڵی ١٥١٤ز/٩٣٠ ک.م نووسراوە و شاربەشار و پێبەپێی شوێن و رێگەی دەرچوونی لەشکری عوسمانی باس کردووە.[4]لەو کاتەدا سمایل لە تەورێز بوو و هەر ئەوەندە زانی لەشکری عوسمانی لە سنوورەکانی ئێرانی نزیک بوونەتەوە، دوو کەس

---

(١) سیوري، ایران عصر صفوی، ص٣٩.

(٢) سفرنامه انجوللو، صص ٣٢٨-٣٢٩.

(٣) سفرنامه انحوللو، صص ٣٢٨-٣٢٩، نیز، عالم آرای عباسی، ص٦٣.

(٤) سفرنامه انجوللو، صص٣٢٨-٣٢٩.

له ئازاترین و بوێرترین فەرماندەکانی بەناوی ئیستاجلو (خان محەمەدی ئیستاجلو) و سارۆپیرە بۆ بەربەرەکانێ و بەرگری ناردە سنوورەکانی ڕۆژهەڵات. تاکو خۆیشی هێزی زیاتر وەسەریەک بنێ، بەڵام چونکە لەشکری نێردراوی شا سمایل لە خۆیان ڕانەدیت بەرەنگاری هێزی تەیاری عوسمانی ببنەوە، گەڕانەوە بۆ شاری خوێ. ڕێک هاوکات شا سمایل لە تەورێزەوە گەیشتە شاری خوێ، بەڵام دەستبەجی بۆ کۆکردنەوەی سوپایەکی بەهێزتر و زۆرتر دیسان بەرەو تەورێز پێی لە ئاوزەنگی توند کرد. سوپای عوسمانی ٢٤ی ئوتی (هەمان ساڵ) پاش گەڕانەوەی شا سمایل بۆ تەورێز گەیشتە جێ و، هەر لە دەشتێک بە ناوی چالدێران، ڕیزی بەست و تۆپ و سەربازی دامەزراند. هەر لەوێش سوپای ئێرانییەکانش ئوردوبەز بوون. بە وتەی زۆر سەرچاوە، سوپای ئێران ٢٤ هەزار کەس بوون. سەرچاوەکانی سەردەمی سەفەوی ڕێزبەندی سوپای ئێرانیان بەم جۆرە باس کردووە:

(خان محەمەدی ئیستاجلو حاکمی دیاربەکر و سارۆپیرەی قۆرچی باشی ئیستاجلو کرانە هێزی پێشڕەو، دورمیش خان، نوور عەلی خەلیفە و خولەفا بەگ و وسێنبەگوڵا و خەلیل سوڵتان لە باڵی ڕاست و مراد ئیستاجلو و کوڕەکانی بابە ئەلیاسی چاوشلو لەگەڵ هەندێک کەسیتر لە چەپەنگی سوپادا و سەید محەمەدی کمونە و میر عەبدولباقی وەزیر و میر سەید شەریفی سەدر و شا سمایل لە ناوەڕاستی لەشکر دامەزران).[1]

ئەنجێلو بەبی ئاماژەپێکردنێک بە چۆنیەتیی دامەرزان و دابەستنی سوپای ئێران و عوسمانی، دەنووسێت، کە دوو دوژمن ٢٣ی ئوتی ساڵی ١٥١٤ (٩١٩/٩٣٠ک) تێک هەڵچوون و دەڵی:

(بەشێکی سوپای ئێران (باڵی ڕاست) بە فەرمانی ئیستاجلو محەمەد بەگ لە گژ لەشکری عوسمانی ڕۆچوو، سوپای ئاناتۆلیایان تەفروتونا کرد. سەنان پاشا بە سوپاکەیەوە بەرپەرچیان دایەوە. هەردووک لا زۆریان لێ کوژرا و لە

(١) سفرنامه انجوللو، صص٣٢٨-٣٢٩.

کۆتاییدا سوپای خان محەمەدی ئستاجلو تێک شکا و خان بەدیل گیرا و سەری بڕا و لەشە بێ سەرەکەی لە خوێندا گەوزی.)[1]

لەم وەزعەدا سارۆپیرە پەلاماری سەنان پاشای دا، ئەگەرچی سوپای ئێران پڕژوبڵاو ببوون بەڵام وا هەڵیانکوتایە سەر دوژمن، کە وەک بریسکە لەشکری پیادەی یەنیچرییەکانیان هەڵتەکاند و قەڵتوبڕیان خستە نێویان و، هێرشەکە هێند گورچوبڕ بوو سەلیم فەرمانی پاشەکشێی دا و هەڵات. هەر لەم کاتەدا جارێکیتر سەنان پاشا وەفریای سوڵتان کەوت و فەرمانی دا، کە تۆپەکان بەرنە بەرەوە و سوپای یەنیچری -سوپای خۆیان- و سوپای دوژمن ئاگرباران بکەن. تەنیا ئیرادێک، کە لەباری سەربازییەوە لەسەر شا سمایل ساغ بۆتەوە ئەوەیە، کە بێ هۆ لە شاری خوێڕا بەرەو چاڵدیڕان هەڵکشا، چونکە لە نێو شاخ و کێو و تەلان و هەڵدێری کوێستانەکان سوپای عوسمانی هەر هیچی لە دەست نەدەهات و دەستی پێ نەدەکرایەوە و تۆپخانەی عوسمانی، کە گرنگترین هۆکاری سەرکەوتنیان بوو بێ ئاگرِ دەما و دەم لەپووش دەمانەوە. ئەگەرچی خان محەمەدی ئیستاجلو و نوور عەلی خەلیفە و ئەژمارێک لە سەردارانی شا سمایل، کە شێوەی شەڕی تۆپ و تۆپخانەی دوژمنیان دەزانی پێشنیاریشان کرد، کە بەر لەوەی دوژمن لە دەشتی چاڵدێران سەقامگیر بێ و تۆپ و تۆپخانە دابەستێ و سوپاکەی دامەزرێنێ، شەوێ پەلاماریان بدەن و لە ناویان بەرن، بەڵام دورمیش خان لە رووویاندا وەستا و شا سمایلیش هەر لەسەر رای دورمیش خان گوتی (کاری ناشایست لەمن ناوەشێتەوە و خودا چی بوێ هەر ئەوەیە.)[2] پیتێر دلاواله لەم بابەتەوە ئاوا دەڵێت:

---

(١) عالم آرای عباسی، ص٤٣ و عالم آرای شاه اسماعیل، ص٥٠٠ و بعد. نولز ئەژماری سوپای عوسمانی ٣٠٠ هەزار کەس نوسیوە. سفرنامه ونیزیان، ص٣٥٩.

(٢) عالم آرای عباسی، ص٤٣. روسلو، احسن التواریخ، ج٢، ص١٠٨١-١٠٨٨. عالم آرای شا اسماعیل، ص٥١٨ و بعد.

(قزڵباش بە سواری ئەسپەوە دەچنە شەڕ. چەکوچۆڵیان تەنیا تیر و کەوان و شمشێر و نێزە و خەنجەر و تەور و قەڵغانە، لایان وایە خۆیڕی و ترسنۆکان تۆپ و تفەنگ دەبەن بۆ شەڕ).[١]

کاتێک تۆپخانەی عوسمانییەکان وەکار کەوت، ئەسپی ئێران بە گرمەگرمی ترسێنەری تۆپ سڵەمینەوە و رەوینەوە و سوپای سوارکار پرژوبڵاو بوون. سەنان پاشا کە، لە دەرفەتێکی وا دەگەڕا، هێزی بڵاوەپێکراوی خۆی کۆکردەوە و وەدووی سوپای ئێران کەوت. هەم ئانجێلو و هەمیش کاترینو رایان وایە، کە ئەگەر تۆپخانەی دوژمن نەبوا و ترس و خۆفی نەخستبا دڵی چارەوی ئێرانی ئەوا سوپای عوسمانی سەری زیندووی نەدەجووڵان و جوقەواریان لێ دەبڕان، [٢] هەروەها ئانجێلۆ دەڵی ئەگەر سوپای عوسمانی بەزیبووا و تێکشکابا، ئەوا هێز و توانای شا سمایل هێزی تەیمووری دەبەزاند، تێکشکانی چالدێران بەڕاستی خامۆشبوونی خۆری ئەفسانەی تێکنەشکان و نەبەزبوونی شا سمایلی ئاوا کرد، بەڵام بەم حاڵەشەوە لە سەفەرنامە ڤێنیزییەکاندا نووسراوە:

(خەڵکی وڵات ئەم شێخەیان هێندەی خودا خۆش دەوێت و زۆری رێز لێ دەگرن و سوژدەی بۆ دەبەن، بەتایبەت سوپا و سەربازەکەی، کە زۆریان هەر بێ خودان و زری دەچنە شەڕ و پێیان وایە شا دەیانپارێزی).[٣]

سەرچاوە ئێرانییەکان دەڵێن شا سمایل خۆیشی لە گۆڕەپانی شەڕەکەدا بووە و تەنانەت پاڵەوانێکی تورک بەناوی مالقوج ئۆغڵی بەدەست شاوە سەری چووە و چەندین جار پەلاماری سوپای تورکی داوە و زنجیری

(١) سفرنامە پیتر دلاوالە، ص٣٤٨.

(٢) سفرنامە انجوللو، ص٣٣٠. کاترینو زیۆ، ص٢٦١.

(٣) بازرگانان ونیزی در ایران، ص٤٢٨.

تۆپەکان پچڕاندووە و سەرەنجام بریندار بووە و لەسەر داوای سەردارەکانی بەرەو تەوریز پاشەکشێی کردووە.[1]

لە حاڵێکدا کاترینو زێنۆ دەڵێت: شا لە شەڕی چاڵدێراندا نەبووە و باس لە بەدیلگیرانی سارۆپیرەی قۆرچی باشیش دەکات. ئانجیلۆش دەڵێت، کە خان محەمەدی ئیستاجلو بەدەستی سوپای عوسمانیی بەدیل گیرا و بە ئاماژەیەکی (تورکە گەورەکە) کوژرا.[2] کەچی سەرچاوە ئێرانییەکان باسی بەدیلگیرانی سوڵتان عەلی ئەفشار دەکەن[3] بەگشتی لەو شەڕە گەورەیەدا چەندین کەس لە سەردارەکانی سوپای سەفەوی وەکو خان محەمەد ئیستاجلو، سارۆپیرەی قۆرچی باشی و وسێنبەگولا، میر عەبدولباقی و سەید محەمەدی کەمونە و میر سەید شەریف سەریان تیاچوو.[4] خەسارەت و زەرد و زیانێکی زۆر بە هەردوولا گەیشت. کتێبی ئەحسەنولتەواریخ کوژراوانی هەردوو بەرەی (٥٠٠٠ کەس)[5] نووسیوە. ئەنجێلو بەبی نووسینی ژمارەی کوژراوانی شەڕ دەڵێت: (هەردوولا زۆریان لێ کوژرا)[6].

فۆلد دەڵێت ژمارەی کوژراوانی شەڕ لە بەرەی سوپای عوسمانیدا سی هەزار بووە.[7] کاترینۆ زێنو لەم بوارەدا قەڵەمی لەپێ کەوتووە.[8] داوای پاشەکشێ و، هەڵاتنی شا سمایل، سوڵتان سەلیم هەر لە شاری خۆیڕا سەرکەوتننامەی بۆ وڵاتانی دەوروبەری نووسی و خۆشی بەرەو تەوریز پێی پێوە نا. تەنانەت لە سەرکەوتن نامەکانیشدا ئاماژە بەمە دەکات، کە شا سمایل

---

(١) احسن التواریخ، ج٢، ص١٠٨٤-١٠٨٨، عالم آرای عباسی، صص٤٢ و ٤٣. عبد بیگ شیرازی تکمله الاخبار، ص ٥٤ و ٥٥.

(٢) کاترینو زنو، ص٢٦١. انجوللو، ص٣٣٠.

(٣) عالم آرای عباسی، ص٤٣. احسن التواریخ، ج٢، ص١٠٧٨.

(٤) عالم جهان آرای عباسی، ص١٨٢. تکمله الاخبار، ص٥٤-٥٥.

(٥) احسن التواریخ، ج٢، ص١٠٨٦.

(٦) انجوللو، ص ٣٢٩-٣٣٠.

(٧) سفرنامه وینزییان، ص٢٩٢.

(٨) سفرنامه وینزییان، ص٢٦٢.

لە شەڕەکەدا بووە. هاوکات شا سمایل بۆ قەرەبووکردنەوەی شکانی چاڵدران سەرقاڵی کۆکردنەوەی سوپا بوو و سوڵتان سەلیمیش لە ترسی هێرشی قزڵباشان، بە وتەی ئانجیێلۆ، تەنیا سێ ڕۆژان لە تەورێز ماوەتەوە.[1] مێژوونووسی تورک ئۆزۆن چارشلی دەڵێت، کە سەلیم شەست ڕۆژان لە تەورێز ماوەتەوە و لەبەر دژایەتیی یەنیچرییەکان لەوێ پاشەکشێی کرد و بەرەو ئاماسیە، تەورێزی بەجێ هێشتووە.[2]

---

(١) سفرنامه انجوللو، ص٣٣٠.

(٢) چارشلی، تاریخ امپراطوری عسمانی، ج ٢، ص٢٨٩.

## ئەنجام:

تێکشکانی چاڵدێران بووە هۆی لە دەستچوونی دیاربەکر و ناوچەکانی دەوروبەری و جیابوونەوەیان لە ئێران. کاری کردە سەر شا سمایل هەر ئەو شکشتەش بوو بە هۆکارێک بۆ ئەوەی پێوەندیی شا لەگەڵ قزڵباش ڕەنگێکی تر بەخۆیەوە بگرێ. ئەوەی راست بێ چاڵدێران یەکەم شکانی شا سمایل بوو لە ژیانیدا. ئەم شکستە هێندە گورچوبڕ بوو، کە ئیتر شا پاش ئەم شەڕە هیچ کات جلی رەشی دانەنا و تا مرد رەشپۆش بوو. سیوری دەڵێت کە: چاڵدێران بوو بەهۆی تێکڕووخانی بیروباوەڕی قزڵباشان لە ئاست رابەرەکەیان، کە وەکو بوونەوەرێکی نەبەز و پێغەمبەرێک دەیانناسی.[1] وەک چۆن لە سەفەرنامە ڤێنیزییەکانیشدا ئاماژە بەوە کراوە، کە ناوی خودا لە ئێراندا لەیاد چووە و بەس ناوی سمایل بۆتە وێردی زمانیان.[2] بەڵام پاش شکانی چاڵدێران و بەردەوامبوونی ، سنوورەکانی نێوان ئێران و عوسمانی گۆڕان و ئەو گۆڕانەش بوو بە ڕێچکەیەک بۆ ساڵەکانی دواتر. ئەگەرچی پاش چەندین کەمێک گۆڕان. سوڵتانی عوسمانیش سەرەڕای سەرکەوتنی لە چاڵدێران بەڵام نەیتوانی دەستی بگاتە ئاواتەکانی و دەستبەجی ئێرانی چۆڵ کرد و دەکرێ بڵێین، کە پاشەکشێی عوسمانییەکان زۆرتر لە هەڵاتن دەچوو و ئەوروپاییەکانیش لە پەنجەرەی سیاسەتەوە چاویان لەم رەفتارەی عوسمانییەکان بوو و هەربۆیە توانا و هێز و بایەخی سوپای ئێرانیان بۆ دەرکەوت. هەربۆیە دواتر ئەوروپاییەکان بۆ یەکگرتن لەگەڵ ئێران بە دژی ئەم دوژمنە هاوبەشەیان وردەوردە بەرەو ئێران خوشین. تێکشکانی چاڵدێران بنەمای دەسەڵاتی ئێرانی گۆڕی. بنەمایەک، کە سەرچاوەی شەرعیبوونی دەوڵەتی سەفەوی بوو. لە دەسەڵاتێکی ئایینی و راسپێردراو و دەستنیشانکراو لەلای خوداوەندەوە بەرەو چەمکە ئاساییەکانی دەسەڵاتی دیوانیی پاشایەتی هەنگاوی نا و بنەماکانی شەرعیبوونی سەفەوی وەکو دەسەڵاتێکی دەستنیشانکراو لە لای خوداوە بۆ دەسەڵاتێکی ئیداری-پاشایەتی دابەزی.

---

(١) سیوری، ایران عصر صفوی، ص٤٥.

(٢) سفرنامە بازرگانان وینزی در ایران، ص٤٢٨.

## سەرچاوەکان:


١- بیابانی، خانبابا، تاریخ نظامی ایران (جنگهای دوره صفویه) تهران، انتشارات ستاد بزرگ ارتشتاران، ١٣٥٣.

٢- تاریخ ایران دوره صفویه، پژوهش کمبریج، ترجمه یعقوب اژند، تهران، امیر کبیر، ١٣٨٠.

٣- ترکمان، اسکندر بیک، تاریخ عالم آرای عباسی، تهران امیر کبیر، ١٣٥٠.

٤- خواندمیر، غیاث الدین بن همام الدین، تاریخ حبیب السیر، به اهتمام محمد دبیر سیاقی، تهران، انتشارات خیام، ١٣٣٣.

٥- دلاواله، پیتر، سفرنامه دلاواله، ترجمه شعاع الدین شفا، تهران، علمی و فرهنگی، ١٣٧٠.

٦- روملو، حسن بیگ، احسن التواریخ، ج٢، تصحیح عبدالحسین نوائی، تهران، اساطیر، ١٣٨٤.

٧- سفرنامه های ونیزیان در ایران، ترجمه منوچهر امیری، تهران، خوارزمی، ١٣٤٩.

٨- سومر، فاروق، نقش ترکان آناتولی در روی کار آمدن صفویان، مترجمین احسان اشراقی، محمد تقی امامی، تهران، گسترده، ١٣٧١.

٩- سیوری، راجر، ایران عصر صقوی، ترجمه کامبیز عزیزی، تهران، نشر مرکز، ١٣٨٤.

١٠- شیرازی، عبدی بیگ (نویدی) تکمله الاخبار، تصحیح عبدالحسین نوائی، تهران، نشرنی، ١٣٦٩.

١١- صفت گل، منصور، ساختار نهاد و اندیشه دینی در ایران عصر صفوی، تهران، مؤسسه فرهنگی رسا، ١٣٨١.

١٢- عالم آرای شاه اسماعیل به کوشش اصغر منتظر صاحب، تهران، بی نا، ١٣٦٣.

١٣- فلسفی، نصرالله، جنگ میهنی ایرانیان در چالدران، تهران، هیر مند، ١٣٨١.

١٤- وحید قزوینی، محمد گاهر، تاریخ جهان آرای عباسی، زیر نظر احسان اشراقی، تهران، پژوهشگاه علوم انسانی و مطالعات فرهنگی، ١٣٨٣.

# هۆکارەکانی شەڕی چاڵدێران

ڕەزا مۆنسەرف

**پوختە:**
یەک لە ڕووداوە گرنگەکانی مێژووی ئێران، دامەزرانی حوکمەتی سەفەوی بوو، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی سەدەی دەیەمی کۆچی مانگی (سەرەتای سەدەی شازدەیەمی زایینی) و ئەو حوکمەتە زیاتر لە ٢٢٥ ساڵ مێژووی ئێرانی داگیر کرد واتە (٩٠٧-١١٣٥ک.م/١٥٠١-١٧٣٣ز). هەر کە سەفەوییەکان دەسەڵاتیان کەوتە دەست (٩٠٧ک.م/ ١٥٠١ز)، ئێران پێی نایە ژیانی سەربەخۆییەوە. دیارە سەردەمانێکی زۆر هەر پێخوستی بێگانە بوو. ئەو سەربەخۆبوونەش لە سایەی فەرمیبوونی شیعەی دوازدە ئیمامەوە بوو، کە سیستمی دەسەڵاتدارییەتیی ئێرانیشی کردە سیستمیکی ئیداری ناوەندگەرا. ڕۆحیات و هەڵسووکەوتی شا سمایلی کە هێشاش گەنج بوو، سەرسووڕهێنەر بوو. ئەو دەمەی دانیشتووانی تەورێز زۆرتریان سوننە مەزهەب بوون، ئەو ئایینی شیعەی وەکو ئایینی فەرمیی وڵات ڕاگەیاند. بە زەبری شمشێر ئایینی شیعەی بەسەر خەڵکی تەورێزدا سەپاند. فەرمانی دا ئێسک و پروسکی بکوژانی باوکی لەناو گۆڕ دەربهێننەوە و ئاگری بدەن. ئەو بە سوپایەکی کەم بەڵام ئازا و بوێر و جەنگاوەرەوە، ملی نا لە سەرکوت و لەناوبردنی میر و خان و سەردارانی دیکەی وڵات. پێشەوا و ڕابەری سۆفییە قزڵباشەکان لە مەیدانی شەڕ هەر نەدەکشاوە و هیچ ترسی لە مردن نەبوو. هەندێکجار پێی وابوو، کە لە مرۆڤی ئاسایی مەزنتر و پیرۆزترە. لە هۆنراوەکانیدا، کە بەناوی خەتایی دەیهۆندەوە، دەیگوت: (گشت ئیمامانی شیعە و تەنانەت خوداوەندیش لە جەستەیدا خۆ دەنوێنیٚ). ئەهلی بەزم و ڕەزم و سەما و گۆرانی بوو.

هەڵبەت ئەمە زۆر جێگەی سەرنج و تێڕوانینە، کە داگیرکردنی کورسیی دەسەڵات لە تەورێز بە یارمەتیی قزڵباشان و دامەزراندنی زنجیرە دەسەڵاتی سەفەوی بە ناو هەستیارترین سەردەمی مێژووی ئێراندا تێدەپەڕی. کاتێک ئێران خەریک بوو پارچە پارچە و لەت لەت دەکرا، دامەزران و بنیاتنانی دەسەڵاتێکی ناوەندگەرا و بەهێز، دەسپێکی گۆڕانێکی سیاسی-مەزهەبی لە ئێران بوو. سەردەمی پاشایەتیی شا سمایل پاش تاجلەسەرنانی، ٢٣ساڵی خایاند و لەگەڵ سەرکوتکردنی دەسەڵاتدارانی ناوچەیی و دەستبەسەرداگرتنی خوزستان، بەغدا، ئازەربایجان، خۆراسان و هەرات و هێرش و پەلاماردانی مائورائولنەهر و سەرەنجام شەڕی چاڵدێران و تێکهەڵچوون لەگەڵ دەوڵەتی زلهێزی عوسمانی بڕایەوە. (٩٠٧-٩٣٠ک.م/١٥١٤-١٥٢٤ز) لەگەڵ دامەزرانی دەسەڵاتێکی شیعە مەزهەب لە پەنا سنوورەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی -زلهێزترین دەسەڵاتێک، کە خۆی بە ئاڵاهەڵگری دنیای ئیسلام دەزانی و بەردەوامیش چاوی بڕیبووە وڵاتی ئێران و بەتایبەت سنوورەکانی رۆژئاوای-، کوشتوکوشتار و قەڵتوبڕی ئایینی و مەزهەبی دەستی پێ کرد و خوێنی هەزاران ئێرانی، لەبەر پێداگری و مکووڕبوونیان لەسەر ئایینی باب و باپیریان رژا. لەولاشەوە بە فەرمانی سوڵتان سەلیم، پاشای دڵڕەق و وشکەسوننەموسوڵمانی عوسمانی، زیاتر لە چل هەزار کەسی شیعەی ئاناتۆلی کەوتنە بەر شمشێری سوڵتان. ئەم ئاگرە وڵاتی تەنییەوە و بوو بە تۆڵەسەندنەوە و بەنێو شەپۆلی رق و قینی قەڵتوبڕی شیعە و سوننەدا تێپەڕی. تا وای لێهات سوپای عوسمانی و سەفەوی، کە هەردووکیان خۆیان بە ئاڵاهەڵگری دنیای ئیسلام دەزانی، لە دەشتی چاڵدێران پێک هەڵپڕژان و سەرەڕای ئازایەتی و جوامێری و بوێری و خۆڕاگریی لەرادەبەدەری فەرماندە و سوپای شا سمایل، بەڵام مخابن سوپای عوسمانی لەبەر تەیاربوونی بە چەکوچۆڵی قورس و دوژمنبەزێن و هەروەها تاکتیکی سەربازیی کاریگەر و کارا سەرکەوت و تەورێز و دیاربەکر و کوردستانی خستە ژێر چنگی.

شا سمایل پاش تێکشکانی لە شەڕی چاڵدێران (٩٢٠ک.م/ ١٥١٤ز) زیاتر لە دە ساڵی ژیانی پاشایەتیی بە خەم و خەفەتی چاڵدێرانەوە ژیا و، بوو بە هاوڕێی جامی شەڕاب و دەستەوداوێنی راو و شەڕاب مایەوە، تاوەکو ١٩ی رەجەبی ساڵی (٩٣٠ک.م/١٥٢٤ز) هەر لە کاتی راو لە دەوروبەری سەراب نەخۆشی ئاوقای بوو و بۆ هەمیشە خەم و خەفەتی بەجێ هێشت. تەرمی شا سمایل گوێزرایەوە هەردەوێڵ(ئەردەبیل) و لەگەڵ قەبری شێخ سەفیەدینی هەردەوێڵی بوونە هاوڕێ.

## پێشەکی:

لە سەرەتاکانی سەدەی دەیەمی ک.مدا، کە باردۆخێکی تەواو مەزهەبی، باڵی وەسەر وڵات کێشابوو-سەردەمێک، کە هەوساری سیاسەت لە چنگ مەزهەبدا بوو- دامەزرانی حوکمەت و دەسەڵاتە سوننەکانی عوسمانی و ئۆزبەکی لە هەردوو لای ئێرانی لێ کەوتەوە. رێک لەو وەختەشدا سەفەوییەکان پێیان نایە گۆڕەپانی جیهانەوە. لەو سەردەمەدا، هۆکارێکی نوێ بە ناوی مەزهەب و ئایین بوو بە گورزی سیاسەت و، دەسەڵاتدارانی خەنیمی موسوڵمان لە دنیای ئیسلامدا کردبوویانە بیانوویەک بۆ بەرینکردنەوەی دەسەڵاتەکەیان. دوو لەشکر و دوو ئاڵاهەڵگری ئیسلام لە بەرامبەر یەکتریدا بوونە خوێنخۆری یەکتر.

دوو دەسەڵات چۆن دامەزران؟ مرید و رێبوارانی رێبازی ئایینی شیعەی دوازدە ئیمامە بە رابەرایەتیی بنەوبنەچەک و تۆرەمەی شێخ سەفی هەردەوێڵی، کە هەنووکە دەسەڵاتێکی شیعە مەزهەبیان بنیات نابوو. لەو بەریش مرید و پەیڕەوانی ئەهلی سوننە و ئەسحابەی پێغەمبەری خودا، کە زۆرتریان سەر بە رێبازی خەلافەتی عوسمانی بوون. لەم نێوەشدا دامەزرانی حوکمەتی ئۆزبەک لە ماورائولنەهر، کە ئەویش هەر خۆی بە کەلەپوورگری پێغەمبەر و ئیسلام دەزانی. هەڵبەت ئەگەرچی ئۆزبەکەکان لەسەر کورسیی دەسەڵاتی ئیسلام لەگەڵ عوسمانییەکان بەشەڕ نەهاتن، بەڵام بەپیکهێنانی بەرەیەکی یەکگرتووی مەزهەبی سیاسی لەگەڵ

عوسمانییەکان بە دژی دەسەڵاتی پێڕۆکەی شیعە، پشتی عوسمانییەکانیان گرت.

ئەگەرچی دامەزرانی دەسەڵاتی سەفەوی لە ئێراندا هەردەم بە ناو شا سمایل ناودێرە بووە، بەڵام ئەوەی راست بێ خۆی ئەوە بیرۆکەی جونەیدی باپیری حەیدەری باوکی شاسمایل بوو، کە ئەو دەسەڵاتە بەهێزە و ئەو دیاردە مەزنەی لە رۆژهەڵات هێنایە دی. ئەگەر هەوڵ و تەقەلا و سەبر و خۆڕاگری و بانگەشەی ژیرانەی ئەو باوک و کوڕە نەبوا، شا سمایل هەر کەس نەیدەناسی.[1]

لەدایکبوونی سەفەوی لە ئێران لە بەرەبەیانی سەدەی شازدەی زایینیدا، نەک هەر بۆ خەڵکی ئێران و دراوسێکانی، بەڵکو بە گشتی بۆ ئەوروپاش وەکو رووداوێکی مێژوویی زۆر گرینگ رەنگی داوە.[2]

ئامانج لەم توێژینەوەیە ئەمەیە، کە وێنەیەک لە چۆنیەتی بنیاتنرانی دەسەڵاتەکەی سەفەوی و بەدەسەڵات گەیشتنی شا سمایلی یەکەم (سەدی ١١ک.م/١٦ز) و، هەوڵ و تەقەلای بۆ بە فەرمیبوونی ئایینی شیعە -کە هۆکارێکی گرنگ بوو، بۆ مانەوەی یەکپارچەیی وڵاتی ئێران و یەکگرتوویی خەڵکی ئێران و سەربەخۆی - بخەینە بەرچاو و هەروەها لێکدانی دوو بیرۆکەی ئایینی – سیاسی مەزهەبی شیعەی دوازدە ئیمامە بخەینە بەر باس. هەروەها لێکدانەوە و شیکردنەوەیەکمان هەبێت بۆ ئایینی سوننە لەسەر بنەمای خەلافەت و جێنشینی. هەروەها هۆکارەکانی سەرهەڵدانی گرنگترین شەڕ پاش دامەزرانی زنجیرە دەسەڵاتەکەی سەفەی بدۆزینەوە و دوا دەرەنجامەکانی لە رێگەی سەرچاوە کۆنەکان و ژێدەرە نوێیەکانەوە دەیخەینە بەرباس و توێژینەوە.

---

(١) هینتس. و.، ١٣٦١، تشکیل دولت ملی در ایران، حکومت آق قویونلوها و ظهور دولت صفوی، تهران، انتشارات خوارزمی.

(٢) براون، ا.، ١٣٤١، تاریخ ادبیات ایران از آغاز دولت صفویه تا زمان حاضر، تهران.

**ئەو هۆکارەکانەی ریگە خۆشکەری شەڕی چاڵدێران بوون:**

لەدایکبوونی دەسەڵاتێکی شیعە مەزهەب لە ناو دنیای ئیسلامدا و بەدەستهێنانی شوناسی سیاسی لەناو چوارچێوەی دەسەڵاتێکی شیعە لە ئێراندا، کە رۆژ لەگەڵ رۆژ زیاتر پەلی داوێشتە دەوروبەری، ترس و دڵەخورپە و تووڕەیی جیهانی سوننەی لێ کەوتەوە. ئەم دەسەڵاتە تازەپێگەیشتووە، کە لەسەر مەزهەب بنیات نرابوو، دنیای ئیسلامی لەرزاند. ئەوە لە کاتیکدا بوو، کە دنیای ئیسلام هەر خۆی لە خۆیدا تان‌وپۆی لێک رەویبۆوە. لە لایەکەوە شێوەی بێبەزەییانەی شا سمایل بۆ دامەزراندنی دەسەڵاتەکەی و هەوڵدان بۆ بڵاوکردنەوەی هزری شیعە لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا و، لەلایەکی دیکەشەوە دوژمنایەتی و کاردانەوەی ئیمپراتۆری عوسمانی لە ئاست فەرمی‌بوونی ئایینی شیعە لە ئێران، بوونە رێگەخۆشکەر بۆ دارِشتنی بناغەی دوژمنایەتی لەناو جیهانی ئیسلامدا. هەروەها ئیمپراتۆری عوسمانی، کە خۆی بە ئاڵاهەڵگری خەلافەتی دنیای ئیسلام دەزانی و بە تەمای داگیرکردنی رۆژئاوای ئێران و بەرینکردنەوەی وڵاتەکەی بوو و، گڕوکف و گڕوتینی باوەڕی ئایینی، لە سەرەتای سەدەی دەیەمی کۆچی بوونە یارمەتیدەر بۆ رووبەڕووبوونەوەی دوو بەرەی موسوڵمان لە دنیای ئیسلامدا.

سوڵتان سەلیم، کە پاشایەکی خۆبەزلزان و پاوانخواز بوو، هیچ حەزی لە رەوتی ئاشتیخوازانەی باوکی نەبوو و، تاقەتی دوژمن و نەیارانی نەبوو و، رێک دەچۆوە سەر رێچکەی باپیری واتە سوڵتان محەمەدی فاتیحی شەڕخواز و چەقبەستوو. سوڵتان سەلیم دەیویست لەگەڵ هەڵایساندنی شەڕ و ئاژاوە، سنووری وڵاتانی بندەستی بەرینتر بکاتەوە و ئاڵای ئیسلام لە دوورترین شوێنی خۆی هەڵکا.

سوڵتانەکانی پێشووتر لە دەسەڵاتی عوسمانیدا، زۆرتر لە هەوای بەرینکردنەوەی بەرەی رۆژئاوای دا بوون، واتە بەرەو وڵاتانی ئەورووپی و پاشا کریستیانییەکان و، بەدرێژایی تەمەنی سوڵتانە عوسمانییەکان تەنیا سوڵتان محەمەدی فاتیح لەگەڵ ئەوەی چاوی بڕیبووە رۆژئاوا و پاش

داگیرکردنی کونستانتینۆپۆلی پایتەختی ئیمپراتۆری بیزانس و قوستەنتەنیە هەوساری ئەسپی سەرکەشی پاوانخوازانەی بەرەو رۆژهەڵات وەرسووڕاند و، لەگەڵ حەسەن بەگی ئاق قۆیونلو (ئۆزۆن حەسەن) شەڕی دابەست و، ترابوزان و قرامانی لێ داگیر کرد، بەڵام سوڵتان سەلیم بە پێچەوانەی رێچکەی باب و باپیری هەر کە کورسیی دەسەڵاتی داگیر کرد، چاوی بڕییە رۆژهەڵات. بەم جۆرە، ئەورووپای خاچپەرست پشوویەکی هاتەوە بەرەخۆ و، بە ئاسوودەیی پاڵی لێ داوە.

## هۆکارەکانی شەڕی چاڵدێران:

لەو کاتەدا تورکە عوسمانییەکان ئیمپراتۆرییەکی بەهێزیان پێک هێنابوو و خۆیان بە جێگر و میراتگری خەلیفەی ئیسلام دەزانی و هەوای داگیرکردنی گشت وڵاتە ئیسلامییەکانیان لەسەردا بوو. بارودۆخی شێواو و ئاڵۆز و کەس‌بەکەسی لە ناو ئێران، بوو بە دەرفەتێکی گونجاو بۆ وەدیهاتنی ئاواتەکەیان تاکوو پلانی بەرینکردنەوەی دەسەڵاتیان جێبەجی بکەن.

بەڵام لەوبەری ئۆقیانووسەکان لەبەر ئەوەی لەسەر زەوی، رێگەی بازرگانانی ئەورووپا-ئاسیا گیرابوو، دەسەڵاتانی دەریاوانی ئەورووپی لە رێگەیەکی نوی دەگەڕان بۆ ئەوەی دەستیان بگاتە وڵاتانی بن دەستیان و بەو نەزمەش وڵاتانی دیکەش داگیر بکەن. هەندێک شوێنی جوگرافیایی نوێیان دۆزییەوە و لە کۆتاییدا گەیشتنە کەنارەکانی ئاسیایی ئۆقیانووسی هیند و کەنداوی فارس، کە هەڕەشەیەک بوون بۆ سەر دورگەکانی باشووری ئێران. لەو لاشەوە هۆز و عەشیرەتی تورکمان و ئۆزبەکیش لە ئاسیای ناوەندیڕا دایمە و دەرهەم پەلاماری سنوورەکانی رۆژهەڵات و باکووری رۆژهەڵاتی ئێرانیان دەدا و، تاڵان و بڕۆیان دەخستە شارەکانییەوە. لەم وەزعە ناسەقامگیرەدا، کە سەربەخۆیی ئێران لە هەموو لاوە کەوتبووە بەر هێرش و هەڕەشەی لێ دەکرا، شا سمایل لەناو دڵی پێویستییە مێژووییەکان و هۆکارە کاریگەرەکانی لایەنی کۆمەڵایەتیی ئێران بەدژی میر و سەردارانی بێگانە و نەیار و بە دژی داگیرکردن و

هەڕەشەکانی دەرەوە ڕاستەوە بوو و، وڵاتی لێکدابڕاو و نیشتمانی پارچەپارچەبووی وەسەریەک خستنەوە و، بۆن و بەرامەی یەکیەتیی پێ بەخشی. یەکیەتی و یەکگرتنێک، کە لەگەڵ بە فەرمیبوونی ئاییینی شیعە، کیانی وڵاتەکەی زیندوو کردەوە. هەر ئەم بڕیارە بووە هۆی پتەوبوون و بەهێزبوونی توانای خۆڕاگری وڵات لە بەرامبەر هێرشەکانی بێگانە و سەربەخۆیی و شوناسی مێژوویی ئێران بەرەو ئاقارێکی تایبەت هەنگاوی نا.[1]

پەیوەندییەکانی دەسەڵاتی عوسمانی و سەفەوی هەر لە سەرەتاوە کاریگەریی بانگەشەکاران و پێڕەوانی تەریقەتی سەفەوی و هەروەها عەشیرەتە کوردەکان و کاریگەریی دەنگە نەیارەکانی لەسەر بوو، کە دەسەڵات و تەخت و تاجی عوسمانییەکانیان وەکو پەناگە و پارێزەری ئاسایشی خۆیان ناس دەکرد، بانگەشەکاران و موریدانی حوکمەتی سەفەوی ناوچەی ئاناتۆلیایان لەبەر هەلومەرجی گونجاوی ئەم ناوچەیە بۆ چالاکییەکانی دژ بە دەسەڵاتی سوننە هەڵبژارد و، هەر لەو ناوچەیەڕا پەیتاپەیتا دژی دەسەڵاتی عوسمانی رادەپەڕین.

وەک چۆن نوور عەلی خەلیفە لە ناوچەی ئاناتۆلیای ناوەڕاستەوە بە یارمەتی پێڕەو و موریدانی خۆی خەریکی بانگەشە و چالاکی بوو و لە سیواس و تۆقات و ئاماسیە و چورۆم عەلەوییەکانی بە ناوی شا سایل ڕێک دەخست و هەر لەو کاتەشدا یەکێک لە عەلەوییەکان، بەناوی شا قولی کوڕی حەسەن خەلیفە، خەلیفەی شێخ حەیدەر واتە باوکی شا سمایل لە ئانتالیە و دەوروبەریڕا بۆ تەریقەتی شا سمایل دەستی دابووە بانگەشە و دواتریش لەو دەرفەتەی، کە سوڵتان بایەزید کورسیی دەسەڵاتی رادەستی کوڕەکەی کرد و کاروباری وڵاتەکەی دایە دەست وەزیرەکانی، ڕاپەڕین و ئاژاوەیان نایەوە. لەم وەزعەدا شازادە سەلیم دەسەڵاتداری ترابوزان بە

(١) ولایتی، ع، ١٣٧٥، تاریخ روابط خارجی ایران در عصر شا اسماعیل اول، تهران، انتشارات وزارت خارجه.

وردی چاوی بڕیبووه راپەڕینەکانی شا قولی و چالاکییەکانی شا سمایل لە ئاناتۆڵیا و سەرجەم هاتوچۆ و هەوڵەکانی عەلەوییەکان. هەر بۆیە کاتێک سەلیم خۆی گەیاندە کورسیی دەسەڵات بەر لەوەی هێرش بکاتە سەر شا سمایل، هاتە سەر ئەوەی، کە لەسەر شیعەکانی ئاناتۆلی بە وردی بکۆڵێتەوە و لە بنج و بناوانیان بگات و چارەی ئەم رەشەبڕینە بکات. جا، کە وای دیت فەرمانی دا گشت شیعەی ئەو ناوچەیە لە حەوت ساڵانڕا تا حەفتا ساڵان دەستنیشان بکرێن و دواتر فەرمانی لە داردانی هەندێکیانی دا، لە لاپەڕە ٢٤٥ی بەرگی یەکەمی کتێبی تاجولتەواریخدا بەم جۆرە باسی ئەم رووداوە دەکا: (بە ئەمر و فەرمانی سوڵتان سەلیم، ٤٠هەزار کەس پاش لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوە، قۆڵبەست کران و هەندێکیان بەڕێی دنیای نەمان کران و، هەندێکیشیان کونجی زیندانیان پێ ئاوەدان کرایەوە.)[1]

هۆکارێکی دیکەی سەرهەڵدانی ئەم شەڕە ئەوە بوو لە پەنا سنوورەکانی رۆژهەڵاتی ئیمپراتۆری عوسمانی و دەسەڵاتی مندالّکارەی سەفەوی، کە ئایدیۆلۆژیای بۆ دەسەڵاتەکەی وەگەڕ خستبوو (جیهادی مەزهەبی) بۆ حوکمەتی عوسمانی تاقەتپڕوکێن بوو و، مەترسییەکی گەورە بوو بۆیان.)[2] بە واتایەکی تر (ئەگەر ورد بڕوانی، سەلیم ناحەقی نەبوو لەسەر رووداوەکانی ئاناتۆلیا بەم جۆرە هەڵوێست بنوێنی و، بەرینبوونەوە و پەلهاویشتنی ئەم دەسەڵاتە نوێیەی سەفەوی وەکوو هەڕەشەیەک بۆ سەر وڵاتەکەی بناسی. ئەو هەر لەسەر ئەو پلانە بەرینەی، کە بەر لەو شەڕە دایڕشتبوو دواتر پەلاماری سووریا و میسری دا و داگیری کردن. سەلیم نەیدەتوانی هەڕەشەی هێرشی شیعەکانی ئەو ناوچەیە لە پشتەوەی سوپاکەی بەهێند نەگرێ.) چونکە ئەژمارێکی زۆر لە تورکەمەنەکان مورید و

(١) اوزون چارشلی، حقی، ا.، ١٣٤٩، سفرنامه ونیزیان در ایران، تهران، انتشارات خوارزمی.

(٢) دلایتی، ع، ١٣٧٥، تاریخ روابط خارجی ایران در عصر شا اسماعیل اول، تهران، انتشارات وزارت خارجه.

پێڕەوی ئایینی شیعە و شا سمایل بوون و دەبوونە هێزی دەرەکیی سوپای ئێران لە ناو ئیمپراتۆری عوسمانی و پاڵپشتی هەوڵەکانی شا سمایل بوون بۆ بنیاتنانی دەسەڵاتێکی شیعە مەزهەب و ببوونە داشداری شاسمایل.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی، کە دامەزرانی زنجیرەی سەفەوی هاوکات بوو لەگەڵ بەرینبوونەوەی ئیمپراتۆریی عوسمانی، کە داشداری ئۆزبەکان بوو، بەم راستییە دەگەین، کە دەسەڵاتەکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا ببوونە لەمپەرێکی مەزن و گران لە بەرامبەر زیندووبوونەوەی سەربەخۆیی و یەکیەتیی نیشتمانی و سیاسی لە ئێران و، لەلایەکی تریشەوە، پاش ئەوەی هۆلاکۆ خان، خەلافەتی عەباسی تێک رووخاند، سوڵتانە عوسمانییەکان، کە خۆیان بە ئاڵاهەڵگری خەلافەتی ئیسلام دەزانی، چاوی حەوتسەریان بەم گۆڕانکارییانەی ئێران هەڵنەدەهات. هەر لەسەر ویستی پاوانخوازی و بەرینکردنەوەی دەسەڵاتەکەیان، خۆیان بە کەلەپوورگر و میراتگری خەلافەتی عوسمانی دەزانی و ئێرانیشیان وەکو بەشێکی ناوچەی ژێر دەسەڵاتی خۆیان پێناسە دەکرد.

تێکشکانی ئۆزبەکەکان، کە دەسەڵات و هاوپەیمانی سوڵتانە عوسمانییەکان بوون ستراتیژی سەربازی شا سمایلی گۆڕی. بەدوای ئەوەش وەزعی رۆژهەڵاتیشی بە تەواوی گۆڕی. خۆی ئەم رووداوە زەنگی خەتەر بوو بۆ عوسمانییەکان، کە هیچ چار نییە دەبی لە ئەنجامدا یەکێک لەم دوو هێزە رێگە بۆ ئەویتریان چۆڵ بکات و هێزی براوە گۆڕەپانی سیاسەت و ململانێ داگیر بکات.

(هۆکارەکەی دیکە، بە فەرمیبوونی شیعە لە ئێران، دوو وڵاتی کردە دوژمنی داخلەدڵ و سەرسەختی یەکتر و ئەم وەزعە پاش چەندین سەدە وردەوردە توانا و هێز و گوڕوتینی سەربازیی هەردووک وڵاتی تواندەوە و لە ئاکامدا، دراوسێ زلهێزەکانی وەک روسیا و نەمسا بە دەرفەتیان زانی و وردەوردە پێیان بۆ هەندێ ناوچەی ئەم دوو وڵاتە کرایەوە) ئەوەی راست بێ، گۆڕینی سیاسەتی عوسمانی لە ئاست ئێران، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٩١٦ ک.م. واتە ئەو دەمەی شا سمایل شیبەک خانی ئۆزبەکی –هاوپەیمانەکەی

عوسمانی- تێک شکاند و گۆڕیچەی لە شیبەک تەنگ کرد و، سەری شیبەک خانی بڕی و کای لەپێستی سەری ئاخنی و، بە باڵوێزێکدا ناردییە دەرباری عوسمانی و، هەر ئەو دەمەی بوو سەلیمی کوڕی عوسمان بایەزید فەرمانڕەوای تەرابووزان بوو، رقی لە پاشای سەفەوی هەڵگرت و پێشتریش ئەم رقەی بە راپەڕیوانی، شۆڕشی لایەنگرانی شا قولی و شیعەکانی ئاناتۆلیا رشت و فەرمانی دا لە سەرانسەری ناوچەی ئاناتۆلیا تەواوی ئەو کەسانەی بە هەر شێوازێک لەو شۆڕشەدا دەستیان بووە بخرینە زیندانەوە و بە خراپترین شێوە ژاری شیعەگەرایی پێ چەشتن و ئەو کەسانەش، کە تاوانەکەیان پشتڕاست نەکرابۆوە -بۆ هەڵاواردنیان لە خەڵکی- ناوچاوانیان داغ کرا.

بەڵام لە حاند شێوەی رەفتار و هەڵسووکەوتی دوژمنانەی سوڵتان سەلیم، لە بەرامبەریشدا، هەوڵەکانی شا سمایلیش بۆ هەڵاییسانی شەڕ بێهۆ نەبوو. سوڵتان سەلیم پیاوێکی پاوانخواز، دەسەڵاتخۆشەویست، وشکە مەزەب و، بوێر و نەترس بووە. مێژوونووسانی تورک بەناوی یاووز واتە توورە و تۆسن و نەترس و مێژوونووسانی ئەورووپیش بە دڵڕەق و بێڕوحم و خوێنخۆر ناوی دەبەن. هۆکاری دیکەش هەیە بۆ هەڵاییسانی شەڕی چاڵدێران، کە لێرەدا ئاماژەیان پێ دەکەین:

١- (سوڵتانە عوسمانییەکان هەردەم خۆیان بە جێگر و میراتگری جێنشینانی پێغەمبەر و خەلیفەی موسوڵمانان دەزانی و دایمە هەوای ئەمەیان لەسەردا بوو و دەیانویست، کە وڵاتە ئیسلامییەکان لەژێر چەتری دەسەڵاتی ئەواندا بن).

٢- لەدایکبوونی دەسەڵاتێکی یەکپارچە لە ئێران، ، کە نەیار و دژی پێکهاتنی بەرەی یەکگرتووی مەزهەبی نێوان عوسمانی و ئێران بوو. ببووە سوورەکوانی ئاواتی لەمێژینەی دەسەڵاتی مەزهەبی سوڵتانە عوسمانییەکان بەسەر موسوڵمانانی جیهاندا.

٣- دژایەتی و داخستنی دەرگای سنوورەکان بەرەورووی ئێران لە سەردەمی بایەزیدی دووەم -لەگەڵ بە فەرمیبوونی ئایینی شیعە- بۆ رێگرتن لە زیارەتی شیعەکانی ئاناتۆڵیا بۆ سەر مەزاری شێخ سەفی

هەردەوێڵی و یان تێکەڵبوونیان لەگەڵ شا سمایل، گڕی دوژمنایەتی دوو وڵاتی بەتینتر کرد.

٤- سوڵتان سەلیم وەکوو زۆر لە پاشا عوسمانییەکان سوننەیەکی وشکەڕۆ بوو، بێبەزەی و بێبەزەیی لە رادەبەدەری شا سمایل لە کوشتنی سوننەکان و سووکایەتی بە چاک و پیر و قەبری ئەبو حەنیفە، تۆی رق و قینی لە دڵی سوڵتان سەلیمدا چاند و ئیتر سوڵتان سەلیم بۆ تۆڵەسەندنەوە تاقەتی ئەم سووکایەتییانەی نەمابوو.

٥- ناردنی پێستی بە کائاخنراوی سەری شیبەک خان بۆ سوڵتانی سوننەی عوسمانی، زەبرێکی کاریگەر و گورچوبڕ بوو لەسەر پێوەندییەکانی نێوان ئێران و عوسمانی و شا سمایل یەکجاری بەو کارەی، سووکایەتی و بێڕێزی بە سوڵتانی عوسمانی کرد و بە ئاشکرا شەڕی پێ فرۆشت و کوژرانی ئێلچی و قاسیدی شا سمایل، کە سەری شیبەک خانی بۆ سوڵتان برد، خۆی بەڵگەیەکی سەلمێندراوە بۆ ئەوە.

٦- خەلیفە و موریدی شا سمایل لە سەردەمی بایەزیدی دووەمدا بە شێوەی جۆراوجۆر لە ئاناتۆلیا بانگەشەی ئایینی شیعەیان دەکرد و قزڵباشەکانیان دەنارده وڵاتی ئێران بەتایبەت لە چەشنی ئەم هەڵسووکەوتە، رەفتاری نوور عەلی خەلیفە دەسەڵاتداری ئەرزنجان، ، کە یەکێک بۆ لە خەلیفە ناودارەکانی شا سمایل، زیاتر لە هەمووان سوڵتانی توورەتر و رقهەستاوتر کرد. نوور عەلی سەردەمی سوڵتان بایەزیدی دووەم، کە سەلیمی کوڕی دەسەڵاتداری ترابوزان بوو هێرشی کردە سەر ئەرزەنجان و داگیری کرد و فەرمانبەر و مووچەخۆر و کاربەدەستانی قزڵباشی لەوێ دەرکرد، بەڵام بایەزیدی دووەم، کە سوڵتانێکی ئاشتیخواز بوو و نەیدەویست وەزعەکە ئاڵۆزتر بێت، فەرمانی بە کوڕەکەی دا، کە ناوچە داگیرکراوەکانی سەر بە ئێران چۆڵ بکات.[١]

---

(١) اوزون چارش لی. ا. ح.، ١٣٧٠، تاريخ عثمانی (از فتح استانبول تا مرگ سلطان سليمان قانونی)، تهران، مؤسسه مطالعات و تحقيقات فرهنگی.

شا قولّی کوڕی حەسەن خەلیفە، گەورەی خانەقای بەکتاشی ئانتالیە بەهاری ٩٧٠ک.م.، کە خۆی بەناوی خەلیفەی شا سمایل ناودێر کرد، کاتێک زانی کوڕەکانی بایەزیدی دووەم بۆ داگیرکردنی کورسیی دەسەڵات سەرقاڵی ململانێ و رقەبەڕقانێن، لە ئانتالیە موریدانی باوکی کۆ کردەوە و بۆ لەناوبردنی دەسەڵاتی عوسمانی بە شێوەی نەریتی قزڵباشان راپەڕی، ئەو ئانتالیەی داگیر کرد و گەورە پیاو و پێشەواو پیرانی ئایینی یەکڕا کوشت و فەرمانی دا، کاروانی خەزێنە و ماڵ و سامانی قورقود بە تالآن بەرن و بەسەر کاروانچییەکانەوە نەچن. دواتر بەرەو ئاناتۆلیا رێی گرتەبەر، لەسەر رێگەی دەوروبەری کوتاهیە لەگەڵ سوپایەکی عوسمانی تێک هەڵچوو و ئەویش تێک شکا و فەرماندەکەی بە دەستی شا قولّی بابا گیانی دەرچوو.

٧- غەڕەیی و خۆبەزلزانی سەرکەوتنەکانی خان ئەحمەدی ئیستاجلو دەسەڵاتدارەکەی دیاربەکر لە بەرامبەر عەلائەدەولەی زولقەدر هێند پەرەی سەند، کە لە نامەیەکیدا (هەڕەشە لە سوڵتان دەکات و بۆ شەڕ هانی دەدا) یان جارێکی تر (نامەیەکی دیکەی بۆ نارد کە هەر بە هەڕەشە بڕایەوە و لەگەڵ نامەکەش قەبزەیەک شمشێر و دەستێک جلی ژنانەی وەکو چارشێو بۆ نارد... قەیسەری رۆم سەری سووڕما لەو هەڵسووکەوتە ناحەز و ناشیرنە و بۆ شەڕ و پەلاماردانی خاکی ئێران لەوەندی دیکەش چێ بوو.

خان محەمەدی ئیستاجلو، ئەو سەردارەی لە گۆڕەپانی شەڕدا ئازایەتی یەکجار زۆری نواندبوو، بەڵام لە مەیدانی سیاسەتدا، نەزان و بێئەزموون بوو. هەروەها هەوڵی شا سمایل لە ئاست سەلماندنی ئەم کردەوەیە، وەک چۆن نووسەر جەهانگوشای خاقان دەڵێت: (کردەوەیەکی نەشیاو و نابەجێ) و بەپێی رای حەسەن روملو (بووە باعیسی فیتنە و ئاژاوە و بشێوی)، سوڵتانی عوسمانی بۆ (هێرشکردنی بۆ سەر خاکی ئێران و پەلاماردانی ئێران) سوورتر لە جاران و لێبڕاوتر لە پێشوو بڕیاری دەدا.[١]

---

(١) مؤلف مجهول، ١٣٤٦، جهانگشای خاقان، عکس برداری از نسخه خطی، اسلام آباد.

٨- ئەودەمەی سوڵتان سەلیم چنگی لە دەسەڵات توند کرد، هەر کام لە باڵوێزانی وڵاتانی بێگانە بۆ پیرۆزبایی ئەم دەستکەوتە بە دیارییەوە چوونە دیوانی سوڵتان، بەڵام چونکە شا سمایل لەگەڵ ئەحمەد -برای سەلیم، کە خۆی بە میراتگری تاج و تەختی پاشایەتی دەزانی و بەحەق دەبوو بە جێگری باوکی- دۆستایەتی و پێوەندیی توندوتۆڵیان بوو. بۆ پیرۆزباییش کەسی نەناردە دەرباری سوڵتان سەلیم و بەجۆرێک لە جۆرەکان سەرەڕای ئەوەی دانی بە بەرحەقبوونی سوڵتان مراددا هێنا و تەنانەت گشت دەسەڵاتدارانی دیاربەکر و ئەرزەنجانیش بە ئاشکرا، سوڵتان سەلیمیان وەکوو پاشای قانوونیی عوسمانی ناو نەبرد. بەو جۆرە شا سمایل لە روانگەی سوڵتان سەلیمەوە نەک دوژمنی مەزهەبەکەی، بگرە نەیاری وڵاتەکەشی و دۆستی شەڕ و هەڵا و ئاگرخۆشکەری دوژمنایەتی و تەنانەت وەکوو دوژمنی خۆیشی سەیری دەکرد.(١)

٩- سیاسەتی دۆستایەتی و هاوپەیمانیەتیی سوڵتانی میسر لەگەڵ شا سمایل ئاوا بوو: سەرەڕای ئەوەی نەیاری ئایینیی یەکتری بوون، بەڵام کەینەوبەینەیان خۆش بوو، پاش داگیرکردنی مەڕو و سەرکەوتنی سمایل بەسەر شیبەک خاندا، پەیامی پیرۆزبایی بە کۆڵێک دیارییەوە ناردە دیوانی شا سمایل. سوڵتانی میسر نۆکەرێکی خۆی بەناوی عەجەمی جناقچی ناردە لای شا سمایل بۆ ئەوەی هاوپەیمانییەک دژی عوسمانی لە نێوان دوو وڵاتەکەدا پێک بێت، ئەو بە شا سمایلی گوت پاش لەناوبردنی سوڵتان سەلیم (مەمالیکی رۆم بۆ تۆ و من بەشم پێوەی نەبی) و شا سمایلیش بۆ ئەوەی دۆستایەتییەکە پتەوتر بکات (سەفیرێکی بە وەرشەکێکەوە و بە دیاری گرانبایی و بەنرخەوە ناردە دیوانی پاشای میسر و بەم جۆرە دەریبڕی تامەزرۆی یەکگرتنە.(٢)

---

(١) پارسا دوست. م، ١٣٨١، چاپ دوم، شاه اسماعیل اول، پادشاهی با اثرهای دیرپای در ایران، تهران، شرکت سهامی انتشار.

(٢) هەمان پارا دوست.

سوڵتان سەلیم لە ڕێی تۆڕێکی بەرینی سیخوڕییەوە و بە یارمەتیی ئەژمارێکی زۆر لە گەورە پیاوانی سوننەی ئێران، کە دژی ئاییینی تەریقەتی شا سمایل بوون ئاگای لە تەواوی پێوەندییەکانی میسر و ئێران بوو. چونکە ترسی یەکگرتنی میسر و ئیرانیشی لەدڵدا بوو، هاتە سەر ئەوە، کە سەفیر و نامەی دۆستانە بنێرێتە میسر و داوای هەڵوەشانەوەی هاوپەیمانییەکەی نێوان میسر و ئێران بکات و پاشان گشت هێز و پێزی خۆی بۆ لەناو بردنی سمایل بخاتەگەڕ.

١٠- هۆکاری بنەڕەتی و ڕاستەقینەی سەلیم پاش داگیرکردنی میسر ساڵی ٩١٨ ک.م. هەر ئەوە بوو، کە چاوی بڕیبووە ناوچەکانی ڕۆژئاوای ئێران. گشت ئەو هۆکارانە بەتایبەت، تایبەتمەندی خووخدی ئەو، رق و بێزاری و قین هەڵگرتنی سوڵتان سەلیم لە ئاست کردەوەکانی شا سمایل بۆ هەلایسانی شەڕی نێوان دوو هێزی ئیسلامی کەم نەبوون.

سوڵتان سەلیم ئەو پیاوە دەسەڵات خۆشەویست و پاوانخواز و توندڕۆ و ئازا و بوێر و بەجەرگ و نەترسەی وا مێژوونووسانی تورک بە یاوز واتە تووڕە و تۆسن و نەترس و مێژوونووسانی ئەوروپاییش بە دڵڕەق و بێبەزە و خوێنخۆر ناوی دەبەن.

## کردەوەکانی سەلیم بەر لە شەڕی چاڵدێران:

چونکە سوڵتان سەلیم، فەرماندەیەکی دووربین و ژیر و تێگەیشتوو بوو، بۆ خۆبواردن لەشەڕ لە دوو بەرەوە، نێردراوی وڵاتانی ئەوروپایی وەکو: (بەغدان) مەلداوی، ئەفلان، ڤێنیز، مسکو، هەنگاریای وەرگرت و لەگەڵیان پەیمانی ئاشتیی بەست و بەم جۆرە بە دڵێکی ئاسوودە و بێخەم لە بەرەی ڕۆژئاواوە، هەموو فکر و هۆش و بیری هێنایە سەر کۆکردنەوەی هێز و سوپا بۆ سەرکوتکردنی شا سمایل.

١- ئەگەرچی سوڵتان دەیزانی زۆرینەی تورکەکانی ئاناتۆلیا شیعەن و لاگری شا سمایلن، بەڵام بۆ شەڕ و بەربەرەکانی لەگەڵیان بە پێویستی زانی

سەرەتا بنکەی هێزی شیعەکانی ئاناتۆلیا لاواز بکا و باوردۆخێک بێنێتە ئاراوە، کە شیعەکان نەتوانن بە ئازادی بانگەشە بۆ دینی شیعە بکەن. بەڵکو لە ترسی راوەدوونان و کوشتنیان لە کوولەکەی تەڕیشدا ناوی شیعە نەبەن -وەک چۆن شا سمایل دەرحەق بە سوننەکانی ئێران هەر وای کرد-. بەمجۆرە بانگەوازێکی بەرینی بۆ ئاییینی سوننە کرد و لەکۆی ئەم مشتومڕانە فتوادەری ئەستەمبوڵ فتوای دا، کە کوشتنی هەر شیعەیەک هەندەی کوشتنی حەفتا خاچپەرست (کافری شەڕکەر) خێر دەداتەوە. وەک چۆن شێخ حەیدەری باوکی شا سمایل لەگەڵ دامەزراندنی تەریقەتی توندڕۆی حەیدەرییە هەر ئەم باوەڕەی لەناو موریدانی خۆیدا چاند،، کە کوشتنی سوننەیەک هەندی کوشتنی پێنج کافری شەڕکەر خێر دەداتەوە. کەوایە دەبینین، کە کردەوەکانی شا سمایل بۆ گۆڕینی ئایین لە ئێراندا لە وڵاتی عوسمانی دژکردەوەی لێ کەوتەوە و ئەم کارانەی شا سمایل و سوڵتان سەلیم بۆ قەڵتوبڕی مەزهەبیی موسڵمانان بەدەستی یەکتری گەورەترین کوشتار و مەزنترین کۆمەڵکوژیی مێژوویی لێ کەوتەوە.

٢- سوڵتان سەلیم بۆ بەرگری لە دووپاتبوونەوەی راپەڕینەکانی وەک راپەڕینی شا قولی بابا، بۆ ئاسوودە بوون و ئەرخەیانبوونی لە بنەبڕکردنی راپەڕینەکان لە پشتەوەی مەیدانی شەڕ، ئاوری رق و قینی هەر بەوەندە دانەمرکا. ئەو راسپاردەی تایبەتی هەڵبژارد و فەرمانی بە راسپاردە و دەسەڵاتدارانی ناوچەکان دا، ئاماری شیعەکانی سەر بە شا سمایل بگرن. ئەوان بەرپرسیار بوون ناوی هەر شیعەیەک لە حەوت ساڵانڕا تا ٧٠ ساڵان تۆمار بکەن. ئەوکات (بەپێی فتوای پێشەوایان زیاتر لە ٤٠٠٠٠ کەس کەوتە بەر رقی سوڵتان. ژن و کچەکانیان بوونە جاریە و کوڕەکانیش بەسەر سوپادا دابەش بوون.[1]

---

(١) عارف ارزرومی، م.، ١٣٠٧ک.م، انقلاب اسلام بین الخاص و العام، تهران، نسخه خطی کتابخانه ملی.

سوڵتان سەلیم بۆ بەرگری لە کردەوەیەکی چاوەڕوان نەکراوی شا سمایل لەمەڕ کۆکردنەوەی سوپایەکی بەهێز و هەروەها بۆ بڵاوەپێکردن و پەرەنپەرەنکردنی سوپاکەی، دەستی دایە هاندانی دژبەران و کوردەکانی ناوچەی کوێستانەکانی رۆژئاوای ئێران، کە پێگەیەکی هەستیاران بوو.- سارم بەگی کورد حاکمی ناوچەی موکریان پیشتر لەگەڵ شا سمایل بەشەڕ هاتبوو، بەڵام دەروەستی شا نەهاتبوو و هەر لەو شەڕەشدا عەبدی بەگی شاملو و یارۆ عەلی مێهردار، دوو سەرداره گەورەکەی قزڵباش سەریان بە فەتەڕات چووبوو- ئەم عەشیرەتانە هەلومەرجێکی باشیان بۆ سەلیم پێک هێنابوو، کە بیانکاتە داردەستی خۆی. سەلیم ئەم هەڵەی قۆزتەوە و پشتی سارم بەگی گرت و داڵدەی دا و نەیهێشت زەبری قزڵباشانی پێکەوی ئەو بە یارمەتی حەکیم ئیدریس بەگی کورد، کە لە میرانی مەزن و خاوەن پێگەی کوردان و دژی شا سمایل بوو توانی (٢٠ کەسان لە میر و خان و دەسەڵاتدارانی کوردستان بکاتە هاوپەیمانی خۆی و نەهێڵێ توخنی شا سمایل بکەون).[(١)]

سوڵتان سەلیم وێڕای تەدارەکی شەڕی تەواوعەیاری خەلیفەیەکی سیخوڕی شا سمایل، کە لە پاکتاوی ئایینی شیعە قوڵبەست و زیندانی کرابوو، بە نامەوە ناردە ئێران و پێی گوت (بڕۆ ئەوەی دیتووتە بۆی بگێڕەوە) سەلیم بەتەما بوو هەر لەگەڵ گەیشتنی قاسیدەکەی بۆ دەرباری ئێران، شا سمایل بۆ شەڕ خۆی ئامادە بکات و بەرەو سنوورەکانی رۆژئاوا هەنگاو بنێ.

سەلیم خەونێکی دیکەی بۆ شا سمایل دیتبوو. داوای لە عوبەیدی هاوپەیمانی کرد، کە هەر دەستبەجی هێرش بکاتە سەر رۆژهەڵاتی ئێران. بۆ ئەوەی (تۆوی ئەو پەسکەیە ئەو چەپەڵی زاڵمی زاڵمگەرە لەسەر زەوی بسڕێتەوە).

---

(١) بدليسی، ا.، ١٣٤٣، تاريخ مفصل كردستان، تهران، مؤسسه مطبوعات علمي.

سوڵتان سلیم زستانی ۹۱۹ک.م. بڕیاریدا بچێتە شەڕی شا سمایل. سەرەتا فەرمانی بە حاکمی ئەرزەنجاندا، کە چەندین هەزار پێڕەوی سەفەویە ئاوەژووی خاکی ئێران بکاتەوە، دواتر بڕیاریدا شیعەکانی ئاناتۆلیا و لایەنگرانی ڕێبازی سەفەوی، کە بە پێچەوانەی خواستی سەلیم لە ڕێبازی ئایینی حەق لایان داوە بکوژێت.[1]

سوڵتان سەلیم ڕۆژی ۱۹ی محەرەم ۹۲۰ک.م. ۱۵۱٤ز لە شاری ئەدرنە بانگەوازی بۆ کۆبوونەوەی سەردار و بەرپرسانی باڵای سەربازی و گەورەکاربەدەستانی ئایینی کرد و لە دانیشتنێکدا لەگەڵیان بڕیاری شەڕی دژی شا سمایلی هێنایە بەرباس. سوڵتان هەندێک باسی لە ئایینی شیعە و زەرەر و زیانەکانی و بانگەشە و بڵاوبوونەوەی لەناو جیهانی ئیسلامدا کرد و کوشتنی شیعەکان و شەڕ و جیهاد لەگەڵ لادەرانی دینی ئیسلامی بە واجب زانی، پێشەوایانی سوننە مەزهەب وتەکانیان سەلماند و فتوای جیهادی دژی کافری قزڵباشیان دا. لەو دانیشتنەشدا وێڕای سەرنجدان بە گێرە و کێشەکانی شەڕ و دژواربوونی راکێشانی لەشکر بەرەو ئێران و دوورودرێژی ڕێگاکە و هەروەها گرفتەکانی توێشوو و خۆراکی ناو ڕێگا و دواهاتەکانی شەڕ لە ناو وڵاتی بێگانە، زۆرتری ئامادەبووان بێدەنگ مانەوە. سوڵتان سەلیم ئەگەرچی مانای ئەم بێدەنگبوونەی بەباشی هەست پێ دەکرد، بەڵام لەبەر زەروورەتی ڕاگرتن و مانەوەی دەسەڵاتەکەی جارێکی تر بڕیارەکەی دووپات کردەوە و هەمدیسان داواکەی بێوەڵام مایەوە. لەپڕدا عەوڵا ناوێک، کە لەناو سوپای یەنیچریدا پیسکە بەرپرسێک بوو، بێدەنگیی شکاند و، گوتی (ئاواتی ئێمەش هەر ئەوەیە و فەرمان، فەرمانی سوڵتانە).

سوڵتان سلیم وڵامی عەوڵای بە هاوڕابوون و هاودەنگبوونی جەماوەری دانیشتووان و سەرکردە سەربازییەکان بەتایبەت یەنیچرییەکان هێنایە ئەژمار و فەرمانی وەڕێکەوتنی سوپای بەرەو ئێران دا.

---

(۱) سرور، علام، ۱۳۷٤، تاریخ شاه اسماعیل صفوی، تهران، مرکز نشر دانشگاهی.

سوڵتان سەلیم لەگەڵ سوپاکەی رۆژی دووشەممە ٢٢ی موحەڕەمی ٩٣٠ک.م/ ١٩ی مارسی ١٥١٤ز) لە ئەدرنەوە وەڕێکەوت و لە دووەم رۆژی سەفەرە مانگی هەمان ساڵ گەیشتە ئەستەمبوڵ. سوڵتان سەلیم وێڕای وەڕێکەوتن و رێگەبڕینی سوپا مەزنەکەی بەرەو ئێران ٤ نامەی بۆ شا سمایل نارد. وەک چۆن باسمان لێ کرد نامەیەکیان کە بە زمانی فارسی نووسرابوو، بۆ عوبەید خانی ئۆزبەکیش نارد و وێڕای دەربڕینی بڕیاری شەڕ لەگەڵ شا سمایل داوای لێ کرد، کە ئەویش لە بەرەی رۆژهەڵاتەوە پەلاماری شا سمایل بدا.

سوڵتان پاش ٢٢ رۆژ مانەوە لە ئەستەمبوڵ بە تەنگەڵانی بیسفۆردا تێپەڕی و پێی نایە ناوچەکانی ئاناتۆلیا. ئەو پاشان ئیسکۆتاری (ئیسکۆدار) بەجێ هێشت و گەیشتە ناوچەی ئەزمیر.

سوڵتان سەلیم ٨ی جەمادی ئەوەڵی ٩٢٠ گەیشتە سیواس بەڵام دوو کێشە داوێنی گرتن: یەکەم میرنشین زولقەدر یارمەتی نەدا، چونکە سەرکەوتنی عوسمانی بەسەر سەفەویدا، دەبووە هۆی لەناوچوونی ئەوان و هەر ئەم دژایەتییەش سوڵتان سەلیمی بۆ تەدارەکی هێزەکانی خستە قەیرانەوە. سەلیم هەوڵی دا رێگەی دەریا بگرێتەبەر و لەڕێی تەرابوزانەوە خۆ قوتار بکات، بەڵام سەرنەکەوت. دووەم کێشەی سوپای یەنیچرییەکان بوو، لەبەر ئەوەی سەلیم زۆری بۆ دێنان و ئەوانیش کەوتبوونە بەر هەڵمەتی بانگەشەی سەفەوییەکان، بەم حاڵەشەوە ئەو سەفەرەیان هەر بە دڵ نەبوو.

(سوڵتان سەلیم بۆ چارەسەری یەکەم گرفت و هەروەها پاڵاوتن و سڕینەوەی کەسانی نارەزا و بەرەنگاربوونەوەی هاندان و دنەدانیان لەلایەن سوپای قزڵباشەوە، کاتێک رێگەی بەرەو ئێرانی دەبڕی[١] لە نێوان ١٤٠

---

(١) استانفوردجی، ش.، ١٣٧٠، تاریخ امپراطوری عثمانی و ترکیه جدید، مشهد، آستان قدس، روضوی.

هەزاری سوپاکەی ٤٠ هەزاری دەرهاویشت[١]. دواتر بەرەو ئەرزەنجان ئاژوا و لە ڕێگایە هەواڵی پێگەیشت، کە سەمەد خانی ئیستاجلو حاکمی دیاربەکر، ئەو وڵاتەی چۆڵ کردووە و زیندەوەری لێ نەماوە و بەڕێی ئازەربایجانی کردوون. (محەمەد خان لەگەڵ پاشەکشێ، ماڵبەماڵ، مەزرا و کێڵگە و مێرگ و چیاکانی سووتاندبوو، بۆ ئەوەی نەبوونی ئالف و ئازۆقە ببێتە بەرگرێک بۆ تاڵان و بڕۆی عوسمانییەکان. هەر ئەم شێوە پاشەکشێیە بووە هۆی دابەزینی ورەی عوسمانییەکان. ئەوە هەر سەربازی یەنیچری بوو کە بە بۆڵەبۆڵ و پرتەپرتەوە لە دەشتی چۆڵ و قاقڕدا بەشوێن سەربازی قزڵباشاندا سەرگەردان بوو. )[٢]

ئەگەرچی خەلیفەکانی شا سمایل لە ئاناتۆڵیا، سوڵتان سەلیمیان بۆ شەڕ بانگهێشت کردبوو و سوڵتان سەلیمیش بە سوپایەکی بەهێز و گەورەوە بەرەو ئێران دەهات و پەیتا پەیتا پەیامی شەڕی دەناردە ئێران، بەڵام شا سمایل لەجیات چارەسەری و تەدارەکی سوپا و ناردنی هێزی بەرگری بۆ ڕۆژئاوای ئێران، بۆ بەرگری لە سنووری وڵاتەکەی، بێخەم و خەیاڵ لە هەوار و زۆزانی ئیران سەرقاڵی راو و رابواردن بوو و ڕەنگە وای بۆچووبا -وەک چۆن نوور عەلی خەلیفە و محەمەد خانی ئیستاجلو خاترجەمیان کردبوو- کە بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشی عوسمانی لە ئاناتۆڵیا بەڕادەی پێویست قزڵباش و لاگری هەیە کە لە کاتی گونجاو هەر بە سووکە فەرمانێکی شا سمایل بەرەنگاری سوڵتان سەلیم دەبنەوە.

سوپای عوسمانی بەلای شاری کەماخ -شارێکە لە ڕۆمی ڕۆژهەڵاتەوە و هاوسنوورە لەگەڵ ئەرزەنجان-دا خۆیان گەیاندە ناو خاکی ئێران. سیخوڕەکان خەبەریان دا بە سوڵتان سەلیم، کە سمایل بەتەمای ڕووبەڕووبوونەوە نییە و نایهەوی لە گژ ئەم سوپا گەورەیە راچی و دەیهەوی سوپای عوسمانی بکێشێتە ناو خاکی ئێران، بۆ ئەوەی سەرما و

(١) هەمان سدور، غلام.

(٢)هەمان سدور، غلام.

برسیەتی داوێنیان بگرێ. سوڵتانی عوسمانی بۆ ڕاگرتنی وڕەی سوپاکەی سیخوڕەکانی خۆی لە زیندان کرد و نامەی سێیەمی خۆی بەناوی (سمایلی شەڕکەر) دەست پێکرد و لەگەڵ ئەوەش فتوای پێشەواکانی ڕێبازی سوننە بۆ لەناوبردنی شا سمایلی دووپات کردەوە و ملی نا لە سووکایەتی و سووک و چروک کردنی شا سمایل.سەلیم بۆی نووسی، کە ماوەیەکە دەشت و کێوی ئازەربایجان کەوتوونەتە بەر سمی ئەسپی عوسمانی، بەڵام هیچ ئاسەوارێک لەو پیاوە بەجەرگە نەماوە. هەروەها لە نامەکەدا وتی، کە ئەگەر لە ترسان هەڵاتووە ٤٠٠٠٠ کەسی لە لەشکری دوژمنبەزێنی هەڵاواردووە و لە نێوان سیواس و قەیسەریە بەجێی هێشتوون.

وەک چۆن لە لاپەڕەی ١٦٣ شۆڕشی ئیسلامیدا وا نووسراوە، کە سوڵتان سەلیم بۆ ئەوەی زیاتر لەوە سووکایەتی بە شا سمایل بکات نامەکەی بە (دەنکێک دەسبێح و خەرقەیەک و کەشکۆڵێکەوە) بۆ نارد و بەم جۆرە بەگوێی هەڵێنا، کە واباشترە شمشێرەکەی فڕێ بدا و لەجیاتی شیر، کەلوپەل و جلکی دەروێشان هەڵگری.

شا سمایل لە وڵامی نامەکانی سوڵتان، نامەیەکی جوان و ئەدیبانەی بۆ وڵامی هەڕەشەکانی نووسی و چقڵ و چزوی بەژانی خستە پاڵ وشەکانی و ئازایەتی و بوێری سوڵتان سەلیمی لە ئاست دوژمنایەتی شەڕخوازانەی خستە ژێر پرسیارەوە. ئەگەرچی شا سمایل بەم کارانەی بەڕاستی سوڵتانی عوسمانی بۆ شەڕ هان دابوو. کردەوەی وەکو: گۆڕینی ئایینی ئێران، کوشتنی سوننەکان، جنێودان و سووکایەتی بە سێ خەلیفەکەی سوننە، ڕوخاندنی مەرقەدەکەی ئەبو حەنیفە، ناردنی پێستی سەری بە کائاخنراوی شیبەک خانی هاوپەیمانی عوسمانی بۆ سوڵتان بایەزیدی دووەم، چالاکیی خەلیفەکانی لە ئاناتۆڵیا و ڕاپەڕینی موریدەکانی لە دژی عوسمانی، سووکایەتیی خان محەمەدی ئیستاجلو بە سوڵتان سەلیم، کردەوەکانی نوور عەلی خەلیفە، پێوەندی و هاتوچۆی شازادە ئەحمەدی ڕەقیبی سوڵتان سەلیم و داڵدە و پەنادانی کوڕەکەی و... بەڵام زۆر سەیرە شا سمایل لەو نامەیەدا لە بابەت هۆکاری دوژمنایەتیی نێوان خۆی و سوڵتان سەلیم، خۆی لێ

نەبان دەکا و پرسیار دەکا: (بەڵام ئێمە هەر نەمانزانی بۆچی ئاوا لێمان بەقیندا چووی؟) و چونکە سوڵتان سەلیمیش ئالودەی مادە هۆشبەرەکان بوو، هەربۆیە بۆ سووکایەتیپێکردن، جوابی نامەکەی، بە قوتوەکی پڕ لە تریاک و سەربەست بۆ ناردەوە و بۆی نووسی، ئەگەر پێویست بوو بەکاری بێنێیت.

سوڵتان سەلیم هەر لە ناوەڕۆکی دەقی نامەکەی سمایلڕا تێگەیشت، کە بەڕاستی ئەو بە تەمای شەڕ نییە و نەشیویست خەجاڵەت و روزەرد و هیوابڕاو بەبی شەڕ بگەڕێتەوە وڵاتەکەی. (فەرمانی دا نامەکە بەو زمانە تورکییەی عوسمانی بنووسن و چارشێوێک و دەستێک جلی ژنانەیان رەگەڵ خست و بە نۆکەرێکی شا قولی بابادا، کە تاجی قزڵباشی لێ سەندبۆوە – پێشتر سیخوڕی شا سمایل بووە و ئاشکرا بووە بۆ سووکایەتیپێکردن تاجەکەیان لێ ئەستاندووە(وە)- ناردیانە دەرباری شا سمایل).(١)

## شا سمایل و دیاریکردنی شوێنی شەڕ لە دەشتی چاڵدێران:

سوڵتان سەلیم بۆ ئەوەی شا سمایل هان بدا بۆ مەیدانی شەڕ، خەبەری لە شێخ ئەحمەد نارد - نۆکەری فەرحشاد بەگی میرێکی ئاق قۆیونلو بوو، کە پێشتر لە زۆزانی ئۆجان لای شا سمایل بوو و ئەو سەردەمی ببووە ملکەچ و گوێلەمستی شا سمایل، بەڵام دواتر چۆتە وڵاتی عوسمانی و خۆی فرۆشتووە- گەلێک قسە و قسەڵۆک و پلانی فریودەرانەیان رێک خست و ناردیە دەرباری شا سمایل. شێخ پاش گەڕانەوەی بۆ دیوانی سوڵتان سەلیم هەواڵێکی خۆش و موژدەیەکی زۆر باشی بۆ سوڵتان سەلیم هێنا. گوتی، کە بەوەڕا، کە دۆستایەتیم لەگەڵ شا سمایلدا بووە باوەڕی پێ کردووم و لەگەڵی دانیشتووم و پێم گوتووە، کە ئەگەر بێت و لەگەڵ سەلیم

---

(١) هەمان عارف ارزومی، م.

دەستەویەخە بی و بچییە بەڕایی شەڕەوە، چونکە زۆرتری سوپا و سەربازانی عوسمانی لاگر و موریدی بنەماڵەی سەفەوین و هەر لە جەرگەی شەڕەکەدا دەچنە ریزی سوپای ئێرانییەوە. شێخ ئەوەشی بە سەلیم گوتووە: پێشنیاری بە شا سمایل داوە، کە بۆ شەڕ لەگەڵ عوسمانییەکان ترسی نەبێ و هەر لێی رانەوەستێ و لەم کاتەشدا شا سمایل فریوی وتە و پێشنیارەکانی شێخی سیخوڕی خواردووە. بۆ بەرەنگاری لەشکری وەگەڕ خستووە و لە شاری خوێڕا شێخی راسپارد، کە خۆی بگەیەنێتە ئۆردووی عوسمانی و بە مورید و لایەنگر و پیڕەوانی سوفییە رابگەیەنێت، کە لە دەشتی چاڵدێران بەرەنگاری هێزی عوسمانی دەبینەوە.[١]

سوڵتان سەلیم، کە پاش ئەم هەمووە ماندووبوون و رێپێوان و فێڵ و تەڵەکەیە سەرەنجام و بە زۆرەملی و بە فرتوفێلان شا سمایلی کێشایە مەیدانی شەڕەوە، شێخ ئەحمەدی سیخوڕی خەلات کرد.[٢]

چاڵدێران دەشتێکی پان و بەرینە و بەرەو رۆژئاوای دەشتەکە زنجیرە کێوێک دەوری داوە لە باکووری رۆژئاوای شاری خوێ(خۆی) و لە باشووری ماکۆ هەڵکەوتووە.

## چۆنیەتی ریزبەندیی هەردوو بەرەی شەڕ لە دەشتی چاڵدێران:

پاش کۆتاییهاتنی شەڕنامەکان و گەیشتنی ئەم هەواڵە بۆ سوڵتان سەلیم، کە شا سمایل ناوچەی دەشتی چاڵدێرانی بۆ شەڕ دەستنیشان کردووە. سەلیم دەستاوبەجی و بێ سێودوو فەرمانی وەڕێکەوتنی بەرەو دەشتی چاڵدێراندا و شەوی چوار شەممەی (دووەمی رەجەبی ساڵی ٩٢٠ ک. م) ٢٣ی ئوتی ١٥١٤ز و یەکەمی گەلاوێژی ٨٩٣ ک.ر. گەیشتە سەر تەپکەیەک، کە لەبەرەی رۆژئاواوە دەیڕوانیە دەشت چاڵدێران.[٣]

---

(١) پورگشتال، هـ، تاریخ امپراطوری عثمانی، تهران، انتشارات زرین.

(٢) پورگشتال، هـ، تاریخ امپراطوری عثمانی، تهران، انتشارات زرین.

(٣) همان ولایتی ع.

سوڵتان سەلیم هەر ئەوەندەی گەیشتە دەشتی چاڵدێران دەستبەجی، کۆڕێکی دانیشتن بۆ راوراوێژ لەسەر پلانی شەڕ پێک هێنا و، لەم کۆڕەدا دوو پێشنیاری هێنایە روو. یەکەمیان بە مەبەستی حەسانەوە و بەرزبوونەوەی توانای سوپاکەی، رۆژێک پشوو بدرێ بە سوپا. پێشنیاری دووەمیشیانی ئەمە بوو، کە هەر بۆ سبەینی لە رۆژهەڵاتی بەیانییەوە شەڕ دەستپێبکەن. ئەم کورە پێشنیاری دووەمی هەڵبژاردو. رەزامەندی خۆیان دەربڕی، کە دەبێ بەیانی زوو چەخماخەی شەڕەکە لێ بدرێ. سەبارەت بە ئەژماری سوپای ئێران لەم شەڕەدا هەندێ لە مێژوونووسە تورکەکان رایان وابووە، کە سوپای ئێران نزیکەی ٨٠ تا ١٥٠ هەزار کەس بووە. ئەو بۆچوونە نادروستە چونکە زۆرتری مێژوونووسە ئێرانییەکان (مێژووی دنیای عەباسی لە ٤١-٤٢) نووسیویانە (شا بۆ بەرەنگاربوونەوەی هێرشی دوژمن رۆژی چوارشەم دووەمی رەجەبە مانگی (دووەمی گەلاوێژی لە ساڵی ٩٢٠ ک. م. بە ٢٠ هەزار سەربازەوە خۆی گەیاندە چاڵدێران و لە بەرامبەر ئەم سوپا زلهێزەدا راوەستا...).

ئەژماری سوپاکەی ئێران، دوازدە هەزار سوارکاری قزڵباش و هەشت هەزار سوارکاری بە ئەزموونیان نووسیوە، کە زۆرتری ئەم هێزە، سواری ئازا و کارامە و بەجەرگی تورکەمەن و قزڵباشان بوون و، لە بەرەی ئێرانییەکاندا، سوپای پیادە نەبووە. چونکە هەر لە یەکەم نامەی سوڵتان سەلیم بۆ شا سمایل تا رۆژی شەڕی چاڵدێران نزیکەی پێنج مانگی بەسەرچووە و، شا سمایل بەر لە وەرگرتنی یەکەم نامەی، یان لەم بڕیارەی سوڵتان سەلیم بۆ شەڕ بێخەبەر بووە یان بە تەمای شەڕ نەبووە. بۆچی؟ چونکە تەنانەت کاتێک لە هەمەدانەوە بەرەو ئازەربایجان رۆیشت هەر دڵنیا نەبوو سوڵتان سەلیم بۆ شەڕ خۆی گەیاندۆتە دیاربەکر.

شایانی باسە کاتێک شا سمایل بڕیای دا بچێتە شەڕی شیبەک خان، قاسیدی ناردە گشت ناوچەکانی بن دەستی لە وڵاتی ئێران و راستەوخۆ داوای هێزی لێ کردن. وەک چۆن لە شەڕی عەلائەدەولەی زولقەدریش ئەم رێوشوێنانەی گرتبووە بەر و هەوڵی کۆکردنەوەی سوپای داوە، بەڵام لە

بابەت سوڵتان سەلیمەوە ئەم هەوڵەی نەدا. ئەوە راستییەکی حاشا هەڵنەگرە، کە سوڵتان سەلیم لە گشت نەیاران و دژبەرانی شا بەهێزتر بووە، بەڵام شا بێتۆپ و تفەنگ و هەر بەم ئەژمارە کەمەوە و بەم سوپا بچووکەوە لە هەمەدانەوە بەرەو ئازەربایجان پێی لە ئاورەنگی توند کردووە. نووسەری جەهانگوشای خاقان لەو بارەیەوە دەنووسێت: (لەگەڵ ١٢٠٠٠ گەنجی سوارکاری کارامە و بە ئەزموون، سەرهەوساری ئەسپی بەرەو ئازەربایجان توند کرد.[١]) غیاسەدین خاندەمیرش هەر جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە: (شا سمایل پادشای دوژمنبەزێنی نەبەز بێ ئەوەی، کە دەست داتە کۆکردنەوەی سوپا، بە دوازدە هەزار سوارکاری ئازا و بەجەرگ و توندئاژۆ، کە ئەودەمی هاوڕێی ئۆردوی شا سمایل بوون)[٢] لە هەمەدانەوە بەرەو ئازەربایجان ئەسپی لینگ دا. حەسەن روملو لە ئەحسەنولتەواریخدا بەم جۆرە پاساو بۆ سستی و کەمتەرخەمی شا سمایل دێنێتەوە (شا سمایل لە بە هێزی بازوو و مەچەک و پاڵەوانیەتی خۆی ڕادی. لەگەڵ هاوسەرەکەی ئەسپی غرور و خۆبەزلزانی و دەمارگرژی هەر لە سەیرانگا و مەیدانی راوەوە بەرەو دوژمن تاودا)[٣] ئەسکەندەر بەگ لەم بابەتەوە جەخت لەسەر ئەمە دەکاتەوە و دەڵێت: (بێئەوەی شەڕ و ڕووبەڕووبوونەوە، لەگەڵ رومییەکان (تورکی عوسمانی) خەم بخاتە دڵی شاوە... و هێندەی باوەڕ بە ئازایەتی و جەنگاوەری و ئیرادەی خۆی بووە، بۆ وەسەریەکخستنی سوپایەک خۆی ماندوو نەکرد و بەم سوپا بچووکەی، کە هاوسەفەر و هاوڕێی دوژمنبەزێنی جەنگاوەری گەردوونشکێن بوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی بەرەو دوژمن ئاژوا).[٤]

---

(١) مؤلف مجهول، ١٣٤٦، جهانگشای خاقان، عکس برداری از نسخه خطی اسلام اباد.

(٢) خواندمیر، غ.، چاپ دوم، ١٣٥٣، تاریخ حبیب الیسر في اخبار افراد بشر، ج٦، تهران، کتابخانه خیام.

(٣) مستوفی، ح.، ١٣٦٢، نزهت القلوب، به سعی و اهتمام گی لستریخ، تهران، دنیای کتاب.

(٤) مؤلف ناشناس (؟)، ١٣٥٠، عالم آرای صفوی، تهران بنیاد فرهنگ ایران.

سەرەڕای ئەوەی شا ٤ مانگی هەر لە چەخماخەی یەکەم بڕیاری سوڵتان سەلیمەوە دەرفەت لەبەر دەستابوو، بەڵام ئەو لەو دەرفەتە خۆی بۆ شەڕ تەیار نەکرد، وەک چۆن لە نامەکەیدا بۆ سوڵتان سەلیم دەنووسێت، کە لەکاتی نووسینی نامەکەدا (لە دەوروبەری شاری ئیسفەهان خەریکی راو بووە) و تەنانەت دیو سوڵتان سەرکردە بەنێوبانگەکەی ئێرانیش کە لە بەلخەوە خۆی گەیاندبوو، ماوەیەک پاش شەڕی چاڵدێران، بەسەر هەواری خاڵیدا کەوت و چووە بەر حوزوری شا سمایل.

## پێکهاتنی لێژنەی شەڕ:

پاش یەکگرتنی هێزی نوور عەلی خەلیفە و خان محەمەد ئیستاجلو لەگەڵ هێزی شا لە تەورێز، شا سمایل هاتە خۆی و شاخ و کێوی کوێستانی خۆی بەجێ هێشت و رووی کردە دەشتی چاڵدێران. ئەگەرچی لە روانگەی ستراتیژیی سەربازی و شەڕەوە ئەم کردەوەیەی شا سمایل رەخنەی لەسەرە، سوپای شا بێ هۆ ناوچە ستراتیژییەکانی باکووری خۆی چۆڵ کرد و هاتە دەشتی چاڵدێران. چونکە ئەوان دەیانتوانی بە ئەسپی سەرکەشی قزڵباش پەلاماری هێزی عوسمانی بدەن و لە قەبرغەی سوپاکەی و لە دوولاوە هەڵمەت بەرن و، بە یارمەتیی ئەم شاخ و کێوەش خۆیان لە گوللەی تۆپی عوسمانی بپارێزن، ئاخر هۆکاری هەرە گەورەی شکانی ئێران لە شەڕی چاڵدێران، تۆپی تۆپخانەی عوسمانی بوو. سوڵتان سەلیم لەبەر ئەوەی نیگەران بوو لە پشتەوەڕا پەلاماری سوپاکەی بدەن بەر لە گەیشتنی بۆ دەشتی چاڵدێران هەندێکی سوپاکەی بۆ داگیرکردنی شاری بایەزید جیا کردەوە، کە کەوتبووە باکووری رۆژئاوای چاڵدێران، بەڵام شا سمایل لەگەڵ سەردارانی شەڕ و سەرکردەکانی خۆی بەر لە گەیشتنی سوڵتان سەلیم بۆ دەشتی چاڵدێران، لێژنەی شەڕی پێک هێنا.

خان محەمەد ئیستاجلو، کە ئاگای لە چۆنیەتی ئارایشت و رێزگرتنی سوپای عوسمانی و چۆنیەتیی دابەستنی تۆپەکان بوو، پاش دیتنی سوپای بەهێز و مەزنی عوسمانی، دەشتی چاڵدێرانی لە بەرژەوەندی نەدیت و

پێشنیاری پاشەکشێ و دەرچوونی لە دەشتی چاڵدێرانی هێنایە ئارا و وتی: (بە فیدات بم، ئەمە هەر نابەجێیە و لە عەقڵی ئێمە بەدوورە بەو ١٨٠٠٠ کەسەوە لەگژ قەیسەر (سوڵتانی عوسمانی) راچین[١] و پاشان وتی: ئەگەر هەر بڕیارە، کە شەڕ بکەین با بەر لەوەی سوپای عوسمانی تۆپەکانی دابەستی، دەرفەتیان پێ نەدەین خۆیان دامەزرێنن و پەلاماریان بدەین. نوور عەلی خەلیفەش هەر هاودەنگ و هاوڕای خان محەمەد بوو، کە هەر شەوێ بەر لە دابەستنی تۆپ و دامەزرانی تورک هەڵمەتیان بکەنە سەر و تەفروتونایان بکەن، بەڵام دورمیش خانی شاملو، -سەرۆک عەشیرەتی شاملو، کوڕی عەبدی بەگی شاملو، خوشکەزای شا سمایل و سەرکردە خۆشەویستەکەی شا سمایل-، (رەنگە لەبەر دژایەتی ئەم عەشیرەت و هۆزانە بووبی) ئەم پێشنیارەی بەدڵ نەبوو و رووی لە خان محەمەد کرد و گوتی: (تۆ هەر بۆ کەیخودای دیاربەکر دەبی)[٢]. شا سمایلیش پێی وابوو ئەم کردەوەیە ناجوامێرانەیە و گوتی: (خۆ من عیزرائیل نیم رۆحی ئەوان دەرکێشم، ئەوەی خودا بیهەوێت هەر ئەوە روودەدات هەربۆیە شا هاتە سەر قسەی دوریش خان، کە هەر ئەو بڕیارە هۆکارێکی دیکەی شکانی ئێرانە لە شەڕی چاڵدێران.[٣]

شا سمایل پاش پێکهێنانی لیژنەی شەڕ لەجیات ئەوەی بە سوپاکەی رابگا و بۆ شەڕ ئامادەیان بکا، لەگەڵ سەردارەکانی بەزمی مەی خواردنەوەی رازاندەوە. وەک چۆن لە نامەیەکی شا تەهماسوب کوڕی شا سمایل، کە بۆ سوڵتان سلێمان کوڕی سوڵتانی سەلیمی دەنێرێ دەنووسێت: (ئەو رۆژە شەڕ بوو بە چارەنووسی باوکم و بەری دەرکی پێ گرت. دورمیش خان و سەرجەم سەرکردە و سەردار و بگرە تەواوی لەشکر

---

(١) عالم آرای صفوی.

(٢) جهانگشای خاقان.

(٣) اوزون چارش لی، ا. ح.، ١٣٧٠، تاریخ عثمانی (از فتح استانبول تا مرگ سلطان سلیمان سلیمان قانونی)، تهران مؤسسه مطالعات و تحقیقات فرهنگ.

مەست بوون. هەر لە شەوێڕا تا بەیانی خواردبوویانەوە و بەزمی خواردنەوەیان رازاوەتر بووە و مەیدانی شەڕیان چۆڵ کردووە... . لەو کاتەوە هەردەم باسی شەڕی چاڵدێران دێتە باسان من هەر دۆعا لە دورمیش خان دەکەم و مشکلۆزمەی بابم دەبێ، کە باوکمی فریو دا و شەڕی پێکرد.)[١]

لە بەرەکەی دیکەی گۆڕەپانی چاڵدێران، سوڵتان سەلیم لێژنەی شەڕی پێک هێنا. سوپاکەی، کە هەر لە ئەدرنەوە تا چاڵدێران ٢٠٠٠ کیلۆمەتریکیان بە ١٥٥ رۆژان بڕیبوو، سەرەڕای ئەم ڕێپیوانە دووروودرێژە بە سگی نیوەتێر و نیوەبرسی ماندوو ببوون و لە ترسی هاتوچۆی سوارکارانی ئاکنجی-کە شیعە و لایەنگری شا سمایل بوون-[٢] دەستبەجی فەرمانی دا بۆ سبەینێ بەیانی چەخماخەی شەڕ لێ بدری.

کوێستانی ناوچەی چاڵدێران شەوی لە ئامێز گرتبوو. هەوای سارد تەنگی بە سەربازی هەردووک بەرە هەڵچنیبوو. هەر دوولا ئاگریان کردەوە. بە دەگمەن هەڵدەکەوێ، کە سەرکردەکانی شەڕێکی ئاوا چارەنووسساز، خەویان لێ بکەوێ، چونکە بەرپرسایەتییەکی قورسیان لەسەر شان بوو.[٣]

شا سمایل پاش ئامۆژگاریکردنی هێزەکانی، نوێژی خەوتنانی کرد و لەناو خێوەتەکەیدا سوورەتی فەتحی قورئانی پیرۆزی خوێندەوە، بەڵام چونکە خەوی لێ نەدەکەوت، بەردەوام لە نێو هێزەکانی دەهات و دەچوو. لەگەڵیان دەدوا و ورە و ئیرادەی سەربازەکانی هەڵدەسەنگاند.

بولێڵەی بەیانی دەنگی بانگ ئاشکرای کرد، کە هەردووک هێزی ئێرانی و عوسمانی روویان لە ماڵی خودا کردووە. هەر بانگی سبحەینان بوو بە بانگەوازێک بۆ سوڵتان سەلیم و شا سمایل، کە وادیارە هەردووکیان خەریکی ئامادە کردنی هێزی، شەڕێکن، کە هەردووک بەرەی رووی لە

---

(١) همان براون.

(٢) اوزون، چارش لی حقی، ا.، ١٣٦٩، تاریخ عثمانی، تهران، مؤسسه کیمان.

(٣) اشتن، م.، ١٣٧٥، شاه جنگ ایرانیان در چالدران و یونان، تهران، انتشارات زرین.

ئایین و قوبلەیەکە. چی وای نەخایاند، لەگەڵ ئاوابوونی تاریکی، خێوەت و ڕەشماڵ خێوەتی هەردووک بەرە هەڵگیرا. هەر ئەو دەشتە، کە شەوێ لانکەی حەسانەوەی سەربازان بوو بۆ بەیانی بوو بە گۆڕەپانێکی پان و بەرین، لە دووررڕا دەنگی کەڕەنا و سنج و تەنبوور لە ناو سوپای یەنیچری بێدەنگیی دەشتی چاڵدێرانی بەزاند و لەو بەریشەوە دەنگی کەڕەنا و دەهۆڵ و سنج و زوڕنا بوو بە میوانی کێوەکانی چاڵدێران و هەردووک بەرە پێگەی سوپاکەی خۆیان دامەزراند و هەردووک لا چاوەڕێی فەرمانی سەرکردەکانیان بوون.(١)

## دەستپێکردنی شەڕی چاڵدێران:

بەم جۆرە، بولێڵەی بەیانی رۆژی چوارشەممی دووەمی رەجەبە مانگی ٩٢٠ ک.م. ٢٣ ئوتی ١٥١٤ز سوپای دوو بەرە بۆ شەڕێکی خوێناوی و خەستوخۆڵ لە دەشتی چاڵدێران-باشووری ماکۆ و باکووری رۆژهەڵاتی خۆی- بۆ شەڕ خۆیان ڕێک خست و سانیان دی.

لە سوپای سەلیمدا، سەنان پاشا حاکمەکەی ئاناتۆلیا بوو بە فەرماندەی بەرەی راست و زەینەڵ پاشای فەرماندەی سوارانی قرامانیشیانی ڕەگەڵ کەوت و حەسەن پاشا فەرماندەی رۆمی ئیلی کرا بە فەرماندەی چەبەنگی سوپا و لە نێوان ئەم دوو باڵەدا، سەربازی پیادەی بێتفەنگ دامەزران و لە پشت ئەم سەربازە نێزەبەدەستانە تۆپەکان دامەزران و سوڵتان سەلیمیش لەگەڵ ئەحمەد پاشای هەرسێک زادە (هەرسک ئۆغلی) وەزیری دەستەڕاست، ئەحمەد پاشای دوقەکین ئۆغلی وەزیری دووەم و مستەفا پاشای چاووش وەزیری سێیەم و هێزی تایبەتی بەرگری لەسەر تەپکەکە دەیانڕوانیە گۆڕەپانەکە.(٢)

---

(١) همان اشتن، م.

(٢) عارف ارزرومی، م، ١٣٠٧ همری، ق. انقلاب اسلام بیت الخاص و العام، تهران، نسخه خطی کتابخانه ملی.

له بەرەی ئێرانیش، شا سمایل، دورمیش خانی بۆ سەرکردایەتیی باڵی ڕاست هەڵبژارد و وسێنبەگولا دەسەڵاتداری پێشووی خۆراسان، خەلیل سوڵتان زولقەدر حاکمی فارس و نوور عەلی خەلیفە روملو حاکمی ئەرزەنجان لەگەڵ هەندێک لە سەرانی قزڵباشی ڕەگەڵ دورمیش خانی خستن. لە چەپەنگی سوپای ئێرانیش، خان محەمەدی ئیستاجلوی کردە فەرماندە و شا سمایلیش لەگەڵ نیزامەدین میر عەبدولباقی وەکیل باشی، سەید شەریفەدینی عەتائەڵا سەدر و سەید محەمەدی کەمونەی نەقیبولئەشراف و هەندێک لە قۆرچییە سوارکارە بێوێنە و ئازاکانی قزڵباش لە ناو دڵی سوپای ئێران سەقامگیر بوون، شا سمایل پێگەی خۆی بە جۆرێک دیاری کرد، کە بتوانی یارمەتیدەری هەردووک باڵی سوپاکە بێت.

شا سمایل پاش دامەزراندن و ئارایشتی هێزەکەی و هەڵبژاردنی فەرماندەی باڵەکانی بۆ وێنە هەڵبژاردنی سارۆپیرەی قورچی باشی بۆ هێزی پێشڕەو و هەڵبژاردنی ییسف بەگی ورساقی حاکمی قەلای کماخ وەکو جێگری سارۆپیرە لەگەڵ دوایین وتە و ئامۆژگارییەکانی بۆ بەرزکردنەوەی ورەی سوپاکەی رووی تێ کردن و وتی: (ئەمڕۆ دەشتی چاڵدێران، بۆتە کەربەلای دووهەم، هەرکەس لەم شەڕەدا لە ڕێی عەلی و کوڕانی عەلی شمشێر بوەشێنی و بکوژرێ، دەگاتە ترۆپکی شەهید بوون و یەکڕاست روو دەکاتە بەهەشت و رووسوورانە و سەربەرزانە دەچێتە زیارەتی عەلی) پاشانیش گۆڕەپانی شەڕی چۆڵ کرد و خۆی گەیاندە هەوێردەی دەشتی چاڵدێران. وەک چۆن نووسەری جەهانگوشای خاقان لەم بابەتەوە دەڵێت: (شا سمایل پاش هەڵبژاردنی فەرماندەکانی، ڕێک بەو دەمودەستە لەگەڵ هەندێک لە قۆرچییەکان بۆ راوە هەوێردە، سوپاکەی بەجێ هێشت.[١]

لەگەڵ گرمەی تۆپی عوسمانییەکان، لەسەر فەرمانی شا سمایل، سارۆپیرەی قۆڕچیباشی فەرماندەی هێزی پێشڕەو هەڵمەتی کردە سەر

---

(١) غفاری قزوینی، ا.، ١٣٦٣، تاریخ جهان آرا، تهران، کتابفرۆشی حافظ.

دوژمن، بەڵام دوژمن زۆر چاک بەرپەرچی هێرشکەی داوە. سارۆ پاش ئەوەی زەبرێکی گورچبڕی پێ کەوت پاشەکشێی کرد و (هەر ئەوەندەی هەواڵی شکست و پاشەکشێی سارۆپیرە بە شا سمایلگەیشت... هەر لەوێڕا – لە مەیدانی ڕاوەوە– هەڕای کردە دوژمن و پەلاماری دان).[١]

شا سمایل نەچووە ناو گۆڕەپانەکەوە و بڕیاری دا وێڕای هێرش بە هەردووک باڵی راست و چەپ بچێتە ناو دڵی سوپای عوسمانی واتە ئەو شوێنەی سوڵتان سەلیم لەوێوە چاوەدێریی دەکرد. هەر بۆیە شا سمایل بە تەمابوو لە پشتەوەڕا پەلاماری یەنیچرییەکان بدا و تێکیان شکێنی و بۆ سەرگرتنی پلانەکەی، سەرکردایەتیی باڵی راستی گرتە ئەستۆ و لەگەڵ خان محەمەدی ئیستاجلو لەگژ چەپەنگی عوسمانی راچوو. هەڵمەت و هێرشی شا سمایل هێند کوتوپڕ و لەناکا و بوو، کە ریزی سوپای شمشێربەدەستی عوسمانییەکانی دادڕی و لەو هەڵمەتە حەسەن پاشای فەرماندەی باڵی چەپی عوسمانییەکان سەری تێدا چوو و هێزەکانی پەڕەوازە و بڕژ و بڵاو بوون. هاوکات خان محەمەدی ئیستاجلو فەرماندەی بەجەرگ و ئازای باڵی چەپی ئێران هێرشی کردە سەر هێزی باڵی راستی عوسمانییەکان. وەک چۆن کاترینۆ زێنو باڵوێزی ڤێنیز لە دیوانی حەسەن بەگی ئاق قۆیونلو دەنووسێت: (خان ئیستاجلو، کە لە پێشەوەی سوپاکەی بوو هێند ئازایانە و بوێرانە هەڵمەتی بردە سەر سوپای ئاناتۆلیا، کە ریزی سوپاکەی هەڵدڕی و تەفروتونای کردن. ئێرانییەکان قەڵتوبڕینەکی وایان خستە ناو تورکەوە، کە تا ئەو کاتی شەڕەکە، ئێران سەرکەوتوو و تورکان بەزیوی گۆڕەپانەکە بوون).[٢]

شا سمایل سەیر ئازایانە هەڵمەتی دەبرد. رووی لە هەر بەرەیەکی دوژمن کردبا، ریزی تورکی عوسمانی هەڵدەبڕی. هێندە بە گوڕو تین، هەڕای دەکردنێ، کە (تەنانەت ئەسپەکانیشی تاقەتی ئەم تینوگۆڕەی شایان

---

(١) همان جهانگشای خاقان.

(٢) امیری، م.، ١٣٦٩، سفرنامە ونیزیان در ایران، تهران، انتشارات خوارزمی.

نەبوو و برستیان لێ بڕابوو. هەر ئەسپی شا سمایل بوو لە ماندوویان دەیفنکاند و لا لغاوەی کەفی لێ دەچۆڕا) ئەو لە ناو جەرگەی شەڕەکەدا ٧ جاران ئەسپی گۆڕی و ئەوپەڕی هێزی وەگەڕخست بۆ ئەوەی چارەنووسی شەڕ بگۆڕی، بەڵام مخابن شا سمایل لەناو گۆڕەپانەکەدا ئاگای لە رۆڵی تۆپخانە نەبوو. ئەو، کە دیتی سواری ئازا و بەجەرگی بە گوللە تۆپی تورکان شەلاڵی خوێن بووە هەندێک لە سوپاکەی رەگەڵ خۆی خست و وەک بریسکەی هەوری تووڕە خۆی گەیاندە سەر تەپکەکە و هەر دەستبەجێ ملی زۆر لە تۆپچییەکانی پەڕاند و زۆر لە تۆپەکانی شکاند و هەر بەو گوڕ و تینەش وەک زێی کەوان وێک هاتەوە و چۆوە رێزی سوپاکەیەوە.[١]

سواری ئێرانی دەیگوڕاند و بە گوتنەوەی دروشمی (ئەڵلا، عەلی، شا) هێند بەتاو ئەسپیان بەرەو دوژمن تین دەدا، کە تۆپخانەی چەپەنگی تورکان لەکار کەوت، بەڵام چونکە هەڵمەتەکەی خان محەمەدی ئیستاجلو بۆ سەر باڵی راستی عوسمانییەکان بە پێچەوانەی هێرشی شا سمایل کاریگەر نەبوو و بەرپەرچ دراوە-سەردار خان محەمەدی ئیستاجلو هەر بە گوللەی تۆپ کوژرا و، ئیتر پاش ئەوە سەنان پاشا فەرماندەی عوسمانییەکان بە مەبەستی یارمەتیدانی حاجی روملی لە (باڵی چەپ)، باڵی راستی سوپاکەی شا سمایلی (کە سەرەڕای تۆپبارانی یەنیچرییەکانیش هەر لەسەرکەوتندا بوو) تێک شکاند و بەم جۆرە سوپای ئێران شکستێکی بێوێنەی خستە لاپەڕەکانی مێژووی خۆی.

لەو شەڕەدا دەیان جار شا سمایل هێرشی بردە سەر تۆپخانە. حەوت جاران ئاڵقەی زنجیری تۆپەکانی هەڵبڕی. کوژرانی ٣٠٠ تفەنگ بەدەستی یەنیچری، کە لە پشتەوەی عەرابەی تۆپەکان سێرەیان گرتبوو دەستکەوتی ئەم هێرشانەی شا سمایل بوو. وەک چۆن سوڵتان سەلیم خۆی شایەتی

(١) رحیم زاده، صفوی، ع.، ١٣٦١، شرح جنگها و تاریخ زندگانی شا اسماعیل صفوی، تهران، کتابفروشی خیام.

شەڕی دەستەویەخەی شا سمایل بووە، سەری سوورماوە لە ئازایەتی و جەنگاوەری و بوێریی شا سمایل.[1]

کاترینۆ زێنو سەفیری پێشوتری ڤێنیز لەناو دەرباری ئۆزۆن حەسەن سەبارەت بە بارودۆخ و گۆڕەپانی شەڕی چالدێران دەنووسێت: (سوڵتان سەلیم، کە یەکەمجار ئەم کوشتوکوشتارەی لەناو ریزی سوپاکەیدا دیت پاشەکشێی کرد و بە تەمای هەڵاتن بوو. رێک لەم وەزعەدا سەنان پاشا وەفریای کەوت و فەرمانی دا تۆپەکان هەندێک نیشانەکانیان لە بەرزایی بگرن و سەربازی یەنیچری و سواری ئێرانی بەیەکەوە تێک گلان، ئەسپی ئێران لە ترسی گرمەی تۆپ دەسڵەمینەوە و هەڵدەستانە سەر پاشوان و لێک دەرەوین و بڵاو دەبوون و گوڵەی تۆپ و گرمەی تۆپخانەی ترسی خستبووە دڵی ئەسپ و ئیتر هەوسار لەدەستی سواری ئێرانیدا نەمابوو).

مێژوونووسانی تورک بۆ باسی ئەو رۆژە (شەڕی چالدێران) گوتوویانە: (چالدێران رەشترین و سامناکترین رۆژی ژیانی عوسمانی بوو و هەندێکیشیان ئەو رۆژەیان بە ناو رۆژی مردن ناو بردووە).[2]

## هەڵاتنی شا سمایل لە گۆڕەپانی شەڕ:

شا سمایل لە جەنگەی شەڕەکەدا، کە زۆر ئازایانە بەرەنگاری دوژمن دەبۆوە، سەیری کرد، کە خەلیل سوڵتان زولقەدر دەسەڵاتداری خۆراسان هەر لەجێی خۆی راوەستاوە. نە خۆی و نە سوپاکەی نەهاتوونە ناو شەڕەوە، شا قۆرچییەکی بە دوادا نارد و داوای لێ کرد، کە خۆ بگەیەنێتە ناو شەڕ، بەڵام خەلیل سوڵتان زولقەدر ملکەچی فەرمانی شا نەما و جوابی نەدایەوە و هەر لە تولحی بەیانییەوە لە شوێنی خۆی چەقی بەستبوو. تا

---

(١) ولایتی، ع.، ١٣٧٥، تاریخ روابط خارجی ایران در عهد شا اسماعیل اول، تهران، انتشارات وزارت خارجه.

(٢) نفس منبع

وای لێهات بێ ئەوەی شمشێر لە کالان دەرکێشێ، پێی پێوەنا و هەڵات. لەو بگرە و بەردەیەدا، گوللە تۆپێک باسکی شا سمایل دەگرێ و زامداری دەکا و لە ئەسپەکەی دەکەوێتە خوارێ. لەپڕ پۆلە سوارێکی عوسمانی بە نێزەوە پەلاماری شایان دا، ئەفسەرێکی هاوڕێی شا بەناوی میرزا سوڵتان عەلی ئەفشار هەڕای کردنێ. سوارکارەکان میرزا سوڵتانیان بەدیل گرت. هەر لەم وەختە مەیتەرێکی گیانفیدای شا بەناوی خزر ئەسپەکەی خۆی دەدات بە شا و بەم جۆرە بەختی سپی روو لە شا دەکا و شا نەجاتی دێ و خۆی دەرباز دەکا.(١)

بەم جۆرە شا سمایل لەگەڵ سێسەد سواری قزڵباش بەشەڕ و قوونەشەڕ مەیدانی شەڕیان چۆڵ کرد و بەرەو تەورێز ئەسپیان تاو دا. لەوێشەوە بۆ دەرگەزینی هەمەدان ملی رێگەیان گرتەبەر. لە شەڕی چاڵدێران لە سوپای ئێراندا، ئەو فەرماندە و سەرکردانەی سەریان تێدا چوو ئەمانە بوون: (خان محەمەدی ئیستاجلو، سارۆپیرەی قۆرچیباشی، وسێنبەگولا، دەسەلاتداری خۆراسان و وەکیل و دەمڕاستی پێشووی شا سمایل، میر نیزامەدین میر عەبدوڵلا، وەکیلی شا سمایل میر سەید شەرەفەدینی عەلی قازی عەسکەر، بەرپرسی پۆستی وەزارەت ناسراو بە سەید سەدرەدین)، کە ئێستا مەرقەدەکەی گونبەزێکی لەسەرە، خولەفا بەگی حاکمەکەی بەغدا، سەید محەمەدی کمونە نەقیبولئەشرەفی نەجەف، سوڵتان عەلی بەگ، هەمزە بەگی کۆسە، سەردار بەگی حاکمی گەنجە و کوڕانی بابا ئەلیاسی چاوشلو و کۆمەڵێک سەربازی دڵسۆزی دیکە). خەسارەت و زیانی عوسمانیش لەو شەڕەدا چی وا کەم نەبوون و هەندێک لەو سەرکردانەی چاڵدێران بوو بە چارەنووسیان ئەمانە بوون: (حەسەن پاشا، میرولئۆمەرای روم ئیلی، حەسەن بەگی سنجق بەگی مورە، عەلی بەگی مالقوچ ئۆغڵی، سنجق بەگی سۆفییە، تور عەلی بەگی سنجق بەگی سیلترە، سلێمان بەگی سنجق بەگی پریزرەند، حەمەد بەگ، سنجق بەگی قەرەسی، ئۆوەیس بەگ،

---

(١) هەمان جهانگشای خاقان.

سنجق بەگی قەیسەریە، ئەسکەندەر بەگی یێسف ئۆغلی، سنجق بەگی نیگدە، قارلی ئۆغلی، سنجق بەگی بەگ شاری و مستەفا بەگی میخاڵ ئۆغلی، سنجق بەگی نیکویی). نۆلز لە مێژووی گشتی تورکەکاندا دەڵێت: (سەلیم سەرەڕای لەدەستدانی ئەژمارێکی زۆر لە هێزی پیادەی، کە زۆری بەلاوە گرنگ نەبوو، کۆمەڵێکی یەکجار زۆری لە سوارانی ئیلیاری، مەقدۆنی، سیربی، ئێپرۆنی، ساڵی و تراسی لێ بە کوشت چوون، کە بێگومان ئەم سوارانە، سەرتۆپ و هێزی ئەسڵی سوپاکەی بوون و زۆریان لەو شەڕەدا لە خوێن گلان یان برینی قوڵیان کەوتە لەش).

شەڕی چاڵدێران، کە تەنیا ڕۆژێکی خایاند، بەپێی وتەی مێژوونووس و نووسەرە ئێرانییەکان ٥ هەزار کەسی لە عەرزێ دا. لەم پێنج هەزارە، دوو هەزاری لە سوپای ئێران و سی هەزاریشی لە سوپای تورک بوون، بەڵام هەندێک لە مێژوونووسە تورکەکان ئەژماری کوژراوانی خۆیان سی تا چل هەزار و کوژراوانی ئێرانیشیان دوو هێندەی ئەمە خەملاندووە.[1]

لە شەڕی چاڵدێران، شا سمایل، سەردار، سەرکردە و سەربازی بەجەرگی قزڵباش و ڕەشسواری ئێرانی، بیرەوەری سەرسووڕهێنەریان لە ئازایەتی و خۆڕاگری و جوامێری و بوێری بۆ مێژوو بەجێ هێشت، بەڵام لە کۆتایی شەڕەکەدا، سەرکردە و سەربازێکی زۆر خەڵتانی خوێن بوون و شای هەردەمنەبەزی سەفەوی، سەرشۆڕی و بەزین و هەڵاتنی خستە سەر مێژووی پڕ لە سەرکەوتن و شانازییەکانی. پاش تەواوبوونی شەڕ، سوڵتان سەلیم گشت دیلەکانی کوشت. هەندێک سەرکەوتننامەی بۆ وڵاتان نارد بۆ وێنە بۆ: سلێمانی کوڕی، حاکمەکەی کرێمە، خانان و میرانی کوردان، سوڵتان مرادی ئاق قۆینلو، مەلیک ڕۆستەم شا پاشای لۆرستان و... .[2]

سەلیم پاش ئەرخەیانبوونی لە تێکشکاندنی سەفەوییەکان، لەبەر ئەوەی ترسی پەلاماری شەوانەی قزڵباشانی لە دڵدا بوو، ڕۆژێک ووچانی گرت و

(١) ولایتی هەمان.

(٢) فریدون بیک، ١٣٧٤ هـ ق، منشآت السلاطین، ج اول.

بۆ سبەینی بەرەو پایتەختی ئێران وەڕێ کەوت. ١٥ی ڕەجەبی ٩٣٠ ک.م گەیشتە تەورێز و دواتر لێژنەیەکی بۆ شەڕ پێک هێنا، کە زستانەکەی لە تەورێز بمێننەوە. پاشان لەگەڵ سەوزبوونەوەی وڵات، لە بەهاریێ، بەرەو قوڵایی خاکی ئێران پێشڕەوی بکەن، بەڵام لەگەڵ دژایەتیی یەنی چرییەکان ڕووبەڕوو بۆوە و پاش ٨ ڕۆژان لە تەورێز، تەورێزی بەرە و ئاماسیە چۆڵ کرد.[١]

## مانەوەی سوڵتان سەلیم لە تەورێز و هۆکاری پاشەکشێ و گەڕانەوەی:

کتێبی مێژووی عوسمانی دەڵێت: یاوز واتە سوڵتان سەلیم، هەشت، نۆ ڕۆژان لە تەورێز مایەوە و نزیکەی هەزار خێزانیی پیشەوەر و دەستڕەنگینی تەورێزی تا دەگاتە بازرگان و کەسانی شایان و لێهاتووی ڕاگوێستە ئەستەمبوڵ، کە لەم نێوەدا، بەدیعولزەمان (نەوەی تەیموور)یش تێوەردرا.[٢]

لەسەر ئەوەیکە سوڵتان سەلیم بۆچی لە تەورێزەوە گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی، مێژوونووسە عوسمانییەکان دەڵێن: (یاوز؛ سوڵتان سەلیم پاش ئەم شەڕە، بەتەما نەبوو دەستبەرداری شا سمایل بێت و لێبڕابوو بە یەکجاری بنەبڕی بکات. هەر بۆیە دەیهەویست زستانی ئەو ساڵە لە قەرەباغی ئازەربایجان بمێنێتەوە و بۆ ساڵی دواتر و بەهاری داهاتوو، ئاگری شەڕەکەی هەڵکاتەوە. هەر بەو هیوایەش لە قەرەباغ پاڵی داوە، بەڵام لەوەڕا، کە دیسان هەندێک لە کاربەدەستانی دەسەڵاتەکەی بەنیازی هاندان و ڕاپەڕاندنی یەنیچرییەکان بوون ناچار قەرەباغی چۆڵ کرد و بەرەو دیاری باب و باپیری گەڕایەوە، چونکە وای بە سەلاح دەزانی، کە تاکو هێوربوونەوەی بارودۆخەکە، زستانەکەی لە ئاماسیە بمێنێتەوە.)[٣]

---

(١) هەمان سرور، غلام.

(٢) اوزون چارشلی، ا. ج، ١٣٧٠، تاریخ عثمانی (از فتح استانبول تا مرگ سلطان سلیمان قانونی)، تهران، موسسه مطالعات و تحقیقات فرهنگی.

(٣) اوزون چارشلی حقی، ا.، ١٣٦٩، تاریخ عثمانی، تهران، موسسه کیان.

بەڵام هۆکارێکی دیکە هۆکاری جوگرافی بوو. عوسمانییەکان بۆ وەدواکەوتن و راونانی شا سمایل دەبوو بچنە ناو قووڵایی کوێستانەکانی ئێرانەوە. سەفەوییەکان لە شەڕ و پێکدادانەکانی دواتریان لەگەڵ عوسمانییەکان بەوپەڕی تواناوە سوودیان لەو شاخ و کێوە وەرگرت. واتە درێژبوونەوەی هێڵی شەڕ و پێوەندییەکانی و گرفتەکانی هاتوچۆ و دابین کردنی خۆراک و هەوای خراپ و سەرما و بەستەڵەکی ئاناتۆلیا و ئازەربایجان بوونە هۆکاری پاشەکشێ. لەو ناوەشدا دەبێ هۆکارێکی گرنگی فەرهەنگی باس بکەین کە خۆی زڕانی بابەتێکی ناو سیستەمی سیاسی، ئایینی سوڵتان سەلیمە. یەنیچرییەکان تۆمارێکی دورودرێژیان بۆ سوڵتان سەلیم نووسی، کە لێرەدا دەیخوێنینەوە: (لانیکەم چلوپێنجهەزار کەس لە وڵاتی ئێمە و بیستهەزار کەسیش لەناو خاکی ئێران بە تۆمەتی لادان و کافربوون بوونەتە قوربانی شمشێری رق و قین. پێشەوا وشکەڕۆکانی ئێمە، مانای رەتکردنەوەی ئیسلام و لادان و کافربوونیان بە باشی بۆ شی نەکردووینەوە -چونکە پێشتر هەر لەسەر فەرمانی سوڵتان سەلیم بۆ بنەبڕکردنی نەیاران و دوژمنەکانی ئیسلام پێشەوا ئایینییەکانی سوننە لە ئەستەمبوڵ فتوایەکیان دابوو سەبارەت بەوەی، کە کوشتنی هەر شیعەیەک زیاتر لە کوشتنی حەفتا خاچپەرست خێر دەداتەوە- و چاوی سوڵتان سەلیمیان بەستووە و بوونە هۆی رژانی خوێنی حەشیمەتێکی یەکجار زۆری بێتاوان. بۆ کوشتنی موسوڵمانان ئێمەیان تین داوە. لە وڵاتێک، کە هەر وەک سوننە رۆژانە پێنج فەرزە نوێژ دەخوێنن و دەستنوێژ هەڵدەگرن و بە جەماعەت نوێژ دەکەن و رۆژوو دەگرن. باوەڕیان بە قورئانە و وێردی زمانیان (لا اله الا الله، محمد رسول الله)یە، مادام ئەوانیش موسوڵمانن ئەی لەسەر کامە شەرع و بە وتەی کام ئایین دەبی بکوژرێن؟ ئەگەر دەستبەردانەوە لەکاتی بانگدان و گوتنەوەی (اشهد ان علیا ولی الله) و (حی علی خیر العمل) بە پێچەوانەی شەرعە، ئەی بۆچی هەندێجار موریدانی شافعی دەستیان بەردەدەنەوە و جارجاریش دەستیان دەگرن و خۆ گوتنی (اشهد ان علیا ولی الله) ئەگەرچی لادانە لە دین، بەڵام خۆ هەر هێندەی

سازکردنی منارەی مزگەوتان، لادانە. دەیجا لادان، هەر بە شەرع نوێخوازییەکی پەسەندکراوە. گشتمان لەسەر ئەوە هاودەنگین و ئۆباڵی بۆ دەکێشین، کە عەلی وەلی و جێگری خودایە و بانگبێژانی ئێمەش لە بانگی سبحەیناندا حی علی خیر العمل دەڵێنەوە. کورتی ببڕینەوە، ئێمە لەگەڵ ئێرانییەکان شەڕ ناکەین و ناچینە بەرەی شەڕی دژ بە ئێران و هەرکاتێکیش بڵێن، کە شەڕی ئێمە لەسەر خاک و نیشتمانە بەم حاڵەشەوە ئەو وڵاتە قاقڕ و خاپوورە بایی ئەم خوێنڕشتنە نییە.(١)

پاش ئەو تۆمارە، سوڵتانی عوسمانی داوای لە زانایانی سوننە کرد کە بە دژی شیعە فتوا بدەن و دیسان داوای ڕەتکردنەوەی شەرعییانە ئاینزای شیعەی لێ کردن، ئەگەرچی ئەم فتوایە هەندێک وەزعەکەی هێور کردەوە، بەڵام بەم حاڵەشەوە یەنیچرییەکانی رازی نەکرد. ئەو دژایەتی و ناکۆکییە لە بیروبۆچوونەکانی سوڵتان و یەنیچریدا، گەیشتە ئاستێک، کە چەند کەسی نادیار هەر ئەو شەوە سێ گوللەیان لە خێوەتی سوڵتان هەڵکرد و ناچار سوڵتانی عوسمانی ملکەچی رای سوپاکەی بۆوە و هاتە سەر ئەوەی، کە بگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی.(٢)

## دەرەنجامەکانی شەڕی چاڵدێران:

شکانی ئێران لە شەڕی چاڵدێران لە ڕیزی هەرە ناخۆشترین شکستەکانی ئێران بووە و کاریگەریی ئەو شەڕە، کە بوو بە بناغە داڕێژەری زنجیرە شەڕی دوو سەد ساڵەی سەردەمی سەفەوییە تاکو ئێستاش ئاسەوارەکەی هەر دیارە و جێپەنجەی ئەو شەڕە ئێستاش کە ئێستایە هەر کوێر نەبۆتەوە.

---

(١) هەمان ولایتی.

(٢) هەمان ولایتی.

ئەسکەندەر بەگ لە کتێبی دنیای عەباسی سەبارەت بە تێکشکانی شا سمایل لەو شەڕەدا دەڵێت:

(بێشک خواوەندی دانا چارەنووسەکەی لەوەدا دیت، کە شا سمایل لە شەڕی چاڵدێران تێک بشکێ، چونکە ئەگەر شا لەو شەڕەدا سەرکەوتبا، رەنگە خەتەری ئەمە بوایە، کە دین و ئیمانی قزڵباشی ساویلکەی باوەڕپێکراو بە، هێز و توانای شا سمایل زیادی کردبا و لە رێگەی راست لایان دابا و فکر و گومان و ئەندێشەی نەشیاو لەسەری دابان.

شکانی شا سمایل لە شەڕی چاڵدێران، دەرەنجامی گرنگی لێ کەوتەوە، کە لێرەدا ئاماژەیان پێ دەکەین:

١- سەرەڕای لەدەستدانی ئەژمارێکی زۆر لە هاوڕێیانی ئازا و بەغیرەت و سەدان کەسی بەئەزموونی، ئەو شەڕە بوو بە هۆی دابڕانی ناوچەی دیاربەکر و ئەرزەنجان و بۆ هەمیشە خرانە سەر ئیمپراتۆری عوسمانی و ئێران هیچ حەقێکی بەسەر ئەو ناوچانەوە نەما.(١)

٢- بەپێی وتەی مێژوونووسانی تورک، لەو شەڕەدا ژنێکی شا سمایل بەدیل گیرا. حەیدەر چەلەبی لە بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێت، (یەک لە دیلەکان، ژنی شای لادەر بوو)(٢). هەندێک نوسیوویانە، بێهروزە خاتوون، ژنە مارەکراوەکەی سمایل و هەروەها تاجلو خاتوون دڵدارەکەی شا سمایل بەدیل گیران و سوڵتان سەلیم لەسەر فتوای پێشەوایانی ئایینی بیهروزە خانمی لە جەعفەر چەلەبی تاجزادە-دادوەری سەربازی- مارە کرد.

٣- لەسەر فەرمانی سوڵتان سەلیم، عەمبار و خەزێنەی شا لەگەڵ هەندێک هونەرمەند و پێشەوەری ئیرانی و بازرگان و دەوڵەمەند، بەرەو ئەستەمبوڵ راگوێزران.

---

(١) سیوری، راجر، ١٣٧٢، ایران عصر صفوی، تهران، نشر مرکز.

(٢) فریدون بیک، ١٣٧٤ هـق، منشات السلاگین، ج اول.

٤- لەشکری عوسمانی لەژێر فەرمانی فەرماندەیی سەنان پاشا، لە دەوروبەری مەرعەش عەلائەدەولەی زولقەدری تێک شکاند و ئەلبستان و سەرامەدیشی وەسەر وڵاتی عوسمانی نا.

٥- شەڕی چاڵدێران بۆ شا سمایل هەر بەوەندە نەبڕایەوە، کە شەڕێک بێت و تەنیا لە دەستدان و دابڕانی هەندێ وڵات و نیشتمان لە خاکی ئێران، بەڵکو هێما و رەمزی نەبەزین و نەشکان و ئازایەتیی شا سمایل لەبەر چاوانی پەیڕەوانی سڕایەوە. پێدەچێت (ئەو شەڕە، ناوبانگی مەزنی و نەبەزیی شای بە جۆرێک خستە مەترسییەوە، کە ئیتر ئەو برینە بە هیچ مەڵهەمیک سارێژ نەدەبوویەوە).[1]

٦- شەڕی چاڵدێران لەسەر شا سمایل کاریگەرییەکی رۆحی و دەروونیی یەکجار قووڵ و درێژخایەنی لەسە شاسمایل بوو. بە چەشنێک پاش ئەوەی لە چاڵدێران راونرا و هەڵات بۆ تەورێز و لەوێشەوە بۆ دەرگەزین خۆی دەرباز کرد. هەر لەبەر ئەو شکستە بەرگی ماتەمی پۆشی و مەندیلی رەشی لەسەر کرد و فەرمانی دا هەرچی شێخ و سەیدە، جلی رەش لەبەر بکەن و قوماشی ئاڵاکانیش هەر رەش بن و بە هێڵێکی سپی لەسەریان وشەی (تۆڵە) (القصاص) بنووسرێت و تەنانەت دەڵێن، کوڕێکی خۆشی ناو نابوو تۆڵە (القصاص) و ئیتر بۆ هەمیشە دەستی لە بانگەشە و پەرەپێدانی ئایینی شیعە هەڵگرت و ببڕاوببڕ باسی شیعە و سوننەی نەکردەوە.

٧- شا سمایل لە دوای شکستی چاڵدێران، تا دواین ساتی ژیانی (تا دە ساڵ دواتر تا ٩٣٠ک.م) هیچ کات ئەرکی فەرماندەیی سوپای لە شەڕەکاندا نەگرتەوە ئەستۆ.[2]

٨- شەڕی چاڵدێران بووە هۆی لەناوچوونی بیروباوەڕی قزڵباشان بە رابەرەکەیان، کە وەکو بوونەوەرێکی خودایی سەیریان دەکرد و لایان وابوو

---

(١) هەمان سیوری، راجر.

(٢) هەمان ولایتی.

خودا له جەستەیدا خۆی دەرخستووە. هیچ کات شکست ناچێتە جەستەیەوە. هەر دوو ساڵ پاش ئەم شکانەی چاڵدێران دەسەڵاتدارە قزڵباشەکانی خۆراسان لە شا سمایل هەڵگەڕانەوە و پاش مردنی، شەڕی هۆز و عەشیرەتە ڕەقیبەکانی ناوخۆی قزڵباشان بۆ گەیشتن بە دەسەڵات، داوێنی وڵاتی گرتەوە.[١]

٩- خۆدوورخستنەوەی سمایل بۆ پێڕاگەیشتن بە کاروباری وڵات پاش شەڕی چاڵدێران، ئەم دەرفەتەی دا بە هەندێک لە بەرپرس و خاوەن دەسەڵاتانی ناوخۆ، کە هەرکامەیان بەپێی هەلومەرجی خۆیان، تواناکانیان بخەنەگەڕ و خۆ بنوێنن. هەر بەمەش گۆڕانێکی گەورە و بەرین لە ڕەهەندی سیاسەتی بەڕێوەبەریی دەسەڵاتی سەفەویدا هاتەدی و پلەی وەزارەت پێگەیەکی بەرزتر و قایمتری لە چاو جاران دەست کەوت.[٢]

١٠- کاریگەریی درێژخایەنی تێکشکانی سەفەوییەکان لە شەڕی چاڵدێران ئەوە بوو، کە بەدرێژایی سێ چارەگە سەدە ئێران کەوتە دۆخی بەرگرییەوە و تا بەدەسەڵاتگەیشتنی شا عەباسی یەکەم ئێران نەیتوانی پەل ببزێوێ.

١١- شکانی چاڵدێران سەرەڕای ئەوەی بوو بە هەوێنی گواستنەوەی دەسەڵاتیی قزڵباش بۆ وەزارەت و بەڕێوەبەرایەتی و بەرزبوونەوەی ئاستی دەسەڵاتی گەورە کارەبەدەستان، بەڵکوو ڕەواڵی کاروبارێک، کە بەسرابۆوە بە بیروباوەڕی مرۆڤ و خووخدەی تاکی کۆمەڵگا، گۆڕا. بە واتایەکی تر لەگەڵ فەرمیبوونی ئایینی شیعە لە سەردەمی شا سمایل و داڕشتنی بناغەی یەکیەتی نەتەوەیی گیروگرفت و کۆسپ و تەگەرەی جۆراوجۆر کەوتە سەر ڕێگەی ئەم ڕێبازە. نەبوونی بنەما و ڕێسایەکی دیاریکراوی نەنووسراوی پوخت و کامڵی سیاسی-ئایینی خۆی یەک لەم گیروگرفتانە بوو. هەر بۆیە دادوەر نەسروڵڵا زینونی کتێبی ڕێساکانی ئەحکامی شێخ جەمالەدینی مەتەهەری حەلی کردە سەرچاوە و ژێدەرێک بۆ بنەماکانی

(١) هەمان سیوری راجر.

(٢) هەمان ولایتی.

فێرکردنی ئایینی شیعە. لەبەر ئەوەی زۆرتری پەرتوک و بلاڤۆکەکانی شیعە بە زمانی عەرەبی نووسرابوو، بۆ گوتنەوەی وانەکانی تەریقەتی شیعە پێشەوا و زانایان لە جەبەل عامل (جبل الجليل) و بەحرەینەوە هاتنە ئێران و بەم جۆرە وردەوردە کۆڵەکە و بنەمای دەکارکردنی فکر و عەقڵ بۆ هۆ و سەبەبی شەرعی قایمتر و پتەوتر کرا و هێورهێور پێشەوا ئایینییەکان جێگەی مورید و خەلیفەی سەفەوییان پڕ کردەوە.[١]

١٢- ساڵ ٩٢٠ک.م. و دوای تێکشکانی چاڵدێران، پلەی وەکالەت وەکوو جێگری دەسەلات جێگەی و پێگەی خۆی دۆڕاند و وەکیل تەنیا وەکوو بەرپرسی دیوانی سەرۆکایەتی واتە لووتکەی دەسەلاتی بەدەستەوە بوو. هەروەها پلەی فەرماندەیی گشتی، کە پلەیەکی گرنگی دەسەلات بوو و هەردەم لە دەست قزڵباشان دابوو، هەر لە بنەڕەتەوە گۆڕدرا.

١٣- پاش تێکشکانی چاڵدێران، سیاسەتی شا سمایل گۆڕدرا. ئێران بە درێژایی سەدەی پازدەی زایینی واتە سەدەی دەیەمی کۆچی مانگی، هەموو هەست و نەست و هۆش فکری خۆی خستبووە سەر ناوچە داگیرکراوەکانی و پاش ئەم شەڕە ئێران رووی کردە رۆژهەلات. پاش ئەو شەڕە هەمیشە هێزی ئێران لە بەرەی سنوورەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی ئامادە بوون. واتە ساڵی ٩٢٠ تا ٩٢٦ ک.م. و هەموو جوڵەیەک و هاتوچۆی دوژمنیان خستبووە ژێر چاودێرییەوە و ئەوەی راست بێ، تەنیا لەمپەر و رێگری سوڵتان سەلیم بۆ داگیرکردنی گشت ولاتە ئیسلامییەکان، دەسەلاتی ئێران بوو، کە نەک داگیرکارییەکانی عوسمانی لەسەر سنوورەکانی نێوان ئێران و عوسمانی بەرتەسک بۆوە بەڵکو بوو بە رێگرێک بۆ بەرینکردنەوەی فکری پاوانخوازانەی دەسەلاتی عوسمانی بەرەو ولاتانی رۆژهەلات وەکوو ماوەرائولنەهر و هیند. هەر ئەوکات سوڵتان سەلیم سەرقاڵی داڕشتنی پلانێک بوو بۆ پەلاماردانی ئێران بەلام لە رێگەی قوستەنتەنیە و ئەدرنە

(١) هەمان ولایتی.

نەخۆشی بەرۆکی گرت و ئاواتی داگیرکردنی وڵاتی ئێرانی بە جوانەمەرگی سەری نایەوە.

شا سمایلیش دوای مردنی سوڵتان سەلیم هەر نانێکی خوارد و نانێکیشی کردە سەدەقە سەری ئیزراییل و سەرینی ئاسوودەیی لەبن سەری نا. وەختیک سەرقاڵی پتەوکردن و قایمکردنی کاروباری وڵات بوو، شەوی دووشەم، نۆزدەی رەجەبە مانگی ٩٣٠ ک.م، کە تەنیا ٣٧ ساڵ و چەند مانگی تەمەنی لە خودا ئەستاندبوو، لە مەنقوتای سەر بە ناوچەی سەراب نەخۆشیی سیلی گرت و تۆڵەی حەوت پشتی سوننەکانی لێ کردەوە، لە مەرقەدی شێخ سەفی هەردەوێلی لە پەنا شێخ ئەسپەردەی خاک کرا. دکتۆر باستانی پارێزی رای وایە، کە شا سمایل هەر خەفەتی چاڵدێران و بەدیلگیرانی ژنەکەی هەڵیگرت و هەر ئەو خەمە سەری پێ نایەوە.

دواتر شا سمایل، هەرچەند بە پێچەوانەی ویستی خۆی بەڵام لەبەر بەدیلگیرانی بێهروزە خاتوونی ژنی ویستی لەگەڵ دوژمن ئاشت بێتەوە، وەفدێکی بە سەرکردایەتیی میر نوورەدین عەبدولوەهاب بە دیاری و سۆقات و نامەوە ناردە دەرباری سوڵتان سەلیم. ئەوان راسپێردرابوون، کە داوای ئازادی و رادەستکردنەوەی بێهرۆزە خاتوون بکەن، بەڵام سوڵتان لێیان هاتە جواب و گوتی: ئەگەر بێت و شا سمایل دەست لە بانگەشەی ئایینی شیعە هەڵگرێت و لەمە بەدوا حورمەتی سێ خەلیفەکەی سوننەی لەبەر بێت و لە مزگەوتان بەناوی سوڵتانەوە خوتبە دادا، رووباری ئەرەس وەکو سەرسنووری هەر دووک وڵات ناودێر بکات، ئەوا دەرگەی ئاشتی دەکەمەوە و ژنەکەشی بۆ دەنێرمەوە).[١]

ئەگەرچی سوڵتان سەلیم وڵامی نامەکەی شا سمایلی هەر نەناردەوە، بەڵام رووی لە جەماعەتی راسپاردە کرد و گوتی: (بەو هەتیوە سوفیلکەیەی (سۆفی ئۆغلی) بنووسن، کە حەزرەتی سوڵتان دەفەرمێت لەسەر فتوای ئەهلی سوننە ژنەکەیم بەشوو داوە. با بزانێ کارەساتێکی چەند بەژان بوو

---

(١) ولایتی. همان.

ئەو کاتەی ژنانی موسوڵمان لەبەر چاوی مێردەکانیان، دەیکردنە ئاوردوی هەوەسی قزڵباشان... ئەگەر خوا یار بێ دیسان لە بەهاردا هەر لە قووڵایی وڵاتەکەی خۆی چاومان بە یەکتری دەکەوێتەوە، جارێکی تریش شانس و ئیقباڵی یەکتری بە تاقی دەکەینەوە.[١]

دواتر فەرمانی دا وەفدی راسپێردراو بنێرنە زیندان. پێداگریی سوڵتان لەسەر ئازادنەکردنی بیهروزە خاتوون و رادەستنەکردنەوەی بۆ ناو ئێران دەنگی داوەو و زۆر لە سوڵتان و دەسەڵاتدارانی وڵات و پێشەوا و زانایانی وڵاتە ئیسلامییەکان و موسڵمانان بە کارێکی نەشیاویان دەزانی و سەرکۆنەی سوڵتان سەلیمیان دەکرد و دەیانگوت سەرکەوتووی شەڕی موسوڵمانان بۆی نییە ژنی دوژمنە موسوڵمانەکەی داگیر بکات.[٢]

نووسەری مێژووی دنیای عەباسی هەمدیسان دەڵێتەوە، لە شەڕی چاڵدێران، تاجلو بەیگوم ژنی شا سمایل وێڕای جەنگاوەرە ئێرانییەکان لەگەڵ تورکی عوسمانی شەڕی دەکرد، بەڵام پاش تەواوبوونی شەڕ بێسەروشوێن بوو. شا سمایل رووی لە دوورمیش خان کرد و وتی: ( ٣٠٠ کەس رەگەڵ خۆت بخە نەوەک قشونی تورکان بێنە سەر رێت، بەشکم هەواڵێکم لە بەیگەم بۆ بزانی) هەر رێک لەوکاتەدا بەرێکەوت میرزا شا حوسێنی ئیسفەهانی وەزیری دورمیش خان، کە کەلوپەلی دورمیش خانی پێ بوو (کە لە تەورێز هاتۆتە دەر... تووشی تاجلو خاتوون دەبێت و میرزا دەستی دەگرێت، کە بیباتەوە بۆ ناو ماڵ و لەوێوە لە مەراغەوە دەربازی بکا، بەشکم خەبەرێک لە شا ببیستن و بیدۆزنەوە. لە رێگە تووشی دورمیش خان دەبێت... بۆ زیارەتی شای شاهان وەرێ دەکەوێتەوە).[٣]

تاجلو خاتوون هاوسەری خۆشەویست و لەبەردڵانی شا سمایل بوو و تا سەرەدەمانی مەرگی شا هەر لە دەربار لای شا مایەوە. دواتریش لە

---

(١) فلسنی، ن.، ١٣٨١، جنگ میهنی ایران در جنگ چالدران، تهران، هیرمند.

(٢) فلسفی، ن.، ١٣٨١، جنگ میهنی ایران در جنگ چالدران، تهران، هیرمند.

(٣) عالم آرای صفوی.

دەرباری شا تەهماسوبی کوڕی پێگەیەکی قایمی بوو. کاتێک شا سمایل سەری نایەوە، تەهماسوبی کوڕی هەر دە ساڵ و شەش مانگان بوو، بە یارمەتیی سەرانی قزڵباش و قازی مەهان حەسەنی وەزیر و (لەسەر فەرمانی تاجلو خاتوون)[1] جێی باوکی گرتەوە. هەربۆیە پێدەچی ئەمە ڕاست نەبێت، کە دەڵێن تاجلو بەدیل گیراوە، یان ئەوەی، کە دەبێ بڵێین لەناو حەرەمسەرای شادا دوو ژن هەر ئەو ناوەیان بووە و یان ئەوەی، کە ژنە ئەسیرەکە ناوی بیهروزە خاتوون بووبێت.

کاترینۆ زێنو ئەمە پشتڕاست دەکاتەوە، کە لە شەڕی چاڵدێراندا ژنی ئێرانیش لە گۆڕەپانەکەدا بوون و دەنووسێت: (لەناو کوژراواندا، هەندێک مەیتی ژنی ئێرانیی تێدا بوو. ئەوان هەروەک پیاوان بەرگی شەڕیان لەبەر کردبوو بۆ ئەوەی شانازیی شەڕ نەسیبیان بێت و چارەنووسیان بە چارەنووسی مێردەکانیانەوە گرێ بدرێ. ئەو باسی هێز و توانای بەرەنگاربوونەوە و بوێریی ژنانی ئێرانی دەکات و دەیانشوبهێنی بە ژنانی ئامازۆن لە سەردەمی کۆندا.[2]

مێژوونووسی ئیتاڵیایی سەبارەت بە شەڕی چاڵدێران دەنووسێت: "لەناو کوژراواندا هەندێک تەرمی ژنی ئێرانیشی تێدا بوو. ئەوان وەکوو پیاوان جلی شەڕیان لەبەر کردبوو بۆ ئەوەی شانازیی شەڕیان پێ ببڕێ و لە چارەنووسی شووەکانیان دانەبڕێن. سەلیم ئازایەتی و جەنگاوەری و بوێریێ ئەوانی بەرز نرخاند و فەرمانی دا لەگەڵ ڕێ و ڕەسمێکی بەشکۆی سەربازی، ئەسپەردەی خاک بکرێن."[3]

---

(١) تمن، ا.، ج ال، ١٣٥٩، ج دوم، ١٣٦٣، خلاصە التواریخ، تهران، انتشارات داشگاه تهران.

(٢) امیری، م.، ١٣٤٩، سفرنامه ونیزیان در ایران، تهران، انتشارات خوارزمی.

(٣) همان پارسا دوست.

## شا سمایل پاش شەڕی چاڵدێران:

شکانی شا سمایل لە چاڵدێران کۆتایی بە دیرۆکی نەبەزبوونی شا هێنا. ئەگەرچی قزڵباش دوای ئەم شەڕە خۆیان بە فەرمانبەر و خزمەتکاری بێغەل و خەوشی شا دەزانی، بەڵام بەڕوونی و لە کردەوەیاندا دەرکەوتبوو، کە ئیتر ئەوان بە چاوی جاران ناڕوانێتە شا و شا سمایلیان بە کەسێکی رۆحانی یان راسپێردراوی خودا نەدەزانی. دوای شەڕ تانوپۆی باوەڕی پیرەوان و موریدانی قزڵباش هەڵوەشاوە و لێک ڕەوی. رووخانی ئەم جۆرە بیروباوەڕە کە ئاسەواری تێکشکانی چاڵدێران بوو، هەم کاری کردە سەر رەفتار و هەڵسووکەوت و بەڕێوەبەرایەتیی شا لەناو دەسەڵاتدا و هەمیش خووخدەی شا سمایلیشی گۆڕی. خۆبەزلزانی و خۆپەرستی لێی وەرسووڕاوە و لێی بوو بە خەفەت و خەمۆکی. عەبا رەشی لەبەر کرد و مێزەری رەشی لەسەر نا و ئاڵای لەشکری وڵاتی گۆڕی و ئاڵای رەشی هەڵدا. لەسەر ئاڵاکە بە رەنگی سپی وشەی تۆڵە (القصاص) نووسرا و بۆ زاڵبوون بەسەر خەم و خەفەتەکەی دەروونیدا شەڕاب بوو بە هاوڕێی و رووی کردە مەی و ساقی.

کەسایەتیی شا سمایل پاش شەڕی چاڵدێران لە بەرامبەر کەسایەتیی بێوێنە و بێهاوتای شای بەر لە شەڕی چاڵدێران بە تەواوی لێک جیاواز بوون. تازە لەناو دەرباری شا باسی بەرینکردنەوەی دەسەڵات، ئازایەتی و جەنگاوەری و کوشتن و قەڵتوبڕی دژبەران بە خەونیش نەدەهاتە باسان و بۆ هەمیشە بنەبڕ بوو. دوای شەڕی چاڵدێران بوو بە پاشایەکی هێمن و لەسەرەخۆ و ئاشتیخواز. شەڕ و ئاژاوە نانەوە لە وڵاتانی دراوسێ لە بن هات. وشکەڕۆیی ئایینی و فیز و هەوای خۆبەزلزانی بە تەواوی سڕایەوە.

لەبەر ئەوەی زۆر لە سەران و سەرکردە گەورەکانی قزڵباشان وەکوو میر عەبدولباقی وەکیل و میر شەریف شیرازی سەدر لەو شەڕەدا سەریان نایەوە و بەکوشت چوون، شا میرزا شا حوسێنی ئیسفەهانی وەکو وەکیل و دەمڕاستی خۆی هەڵبژارد و هەموو ئیختیار و گشت راوبۆچونێکی بەو سپارد و خۆشی زیاتر لە جاران بۆ ئیدارە و بەرەوپێشبردنی رەوتی

دەسەڵاتداری وڵات خۆی دەبوارد و (بۆ جێبەجێ کردن و راپەڕاندنی کاروباری دەسەڵات راسپێردراوە و هەموو مافێکی دەسەڵاتداریەتیی دەدرێتی و گشت میر و ئەرکانی دەسەڵات و هەمووی وەزیر و گەورە پیاوان دەبی ملکەچی فەرمانی ئەوبن و بەرگی فەرمانبەری و ملکەچی بپۆشن و بێ‌پرس و مەسڵەحەتی ئەو دەست بۆ بچووکترین ئەرک و گەورەترین ئەرک نابەن).(١)

رادەستکردنی ئیختیدار و دەسەڵات بەم شێوەیە ئەوە دەردەخا، کە شا سمایل تەنانەت هیچ حەزی لە بەڕێوەبردنی کاروباری دەسەڵاتداری رۆژانەی نەماوە و ورد و درشتی ئەرکەکانی بە وەکیلەکەی سپاردوە.

شا سمایل تەنانەت دەستی لە کوشتنی مێر و حاکمە سەرکەش و یاغییەکانیش هەڵگرت و تەنیا لەو نێوەدا داخی خەلیل سوڵتان زولقەدر حاکمەکەی شیرازی زۆر لە دڵ گران هاتبوو، کە لە شەڕی چاڵدێراندا لەگەڵ سوپاکەی هەڵاتبوون. ئەویشی وەکو جاران بە شێوەیەکی بێ‌ڕۆحمانە نەکوشت بەڵکو پاش گەڕانەوەی لە درگەزینەوە بۆ تەورێز مانگی شابانی ٩٢٠ک.م. بڕیاری کوشتنی سوڵتان خەلیل زولقەدری دا. بۆ ئەمەش، قۆرچییەکی خۆی بەناوی کۆر سلێمان ناردە شیراز. قورچی، کە گەیشتە دیوانی سوڵتان خەلیل، بە سرتە بەگوێی چپاند کە: (بە پێی فەرمانی شا سمایل لەسەر تاوانی هەڵاتنت لە شەڕی چاڵدێران دەبێ ١٢ قەمچیت لێ بدرێ، بەڵام چونکە بەڕێوەبردنی ئەم فەرمانە لەبەرچاوی نۆکەر و کاربەدەستانت سووک و چرووکت دەکا) داوای لێ کرد لە شوێنێکی چۆڵ فەرمانەکە بەڕێوەبەرێ. زولقەدر، کە ١٢ قەمچیی لە چاو ئەو تاوانە گەورە پێ کەم بوو و خودا خودای بوو شا بەوە لە کۆڵی بێتەوە، دەستبەجێ لەگەڵ قورچی چوونە ژوورێکی چۆڵ و ئەوجار کۆر سلێمان فەرمانی

---

(١) خواندمیر، ا.، ١٣٧٠، تاریخ شاه اسماعیل و شاه تهاسب صفوی (ژیل حبیب السیر)، تهران، نشر گستره.

کوشتنی پێ ڕاگەیاند و، ئەویش ملکەچی فەرمان مایەوە و قۆرچی شمشێری لە کالان هەڵبڕی و سەری پەڕاند.

سەبارەت بە سەرکوتکردنی دەسەڵاتدارانی مازەندەران، واتە شەڕوانشا (شێخ شا)، کە ساڵانێکی زۆر بوو لەگەڵ شا سمایل دانویان نەدەکولا و لێک نەبان بوون و باب و باپیری شاسمایلیش هەر لە شەڕی شەڕوانییەکان بە کوشت چووبوو و، هەروەها سەبارەت بە ئۆزبەکەکان، تەواو گۆڕا و ئاشتەوایی لە نێوانیاندا سەری گرت. تەنیا جارێک نەبێت سوپای ناردە شەڕی گورجستان و بەپێی وتەی ئەسکەندەر مونشی: (بوو بە خانەخوێی کۆڕی بەزم و ڕەزم و شەڕاب و مەی. لەو دە ساڵەی کۆتایی ژیانیدا پێی وابوو، کە ئەرکی سەرشانی بۆ پەرەپێدان و بانگەشەی ئایینی شیعە بە تەواوی بەڕێوە بردووە و تەنیا لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی و سەرقاڵی قایمکردنی دەسەڵاتەکەی و پەرەپێدانی شیعە بوو.

ئەگەرچی پاش شەڕی چاڵدێران، سیاسەتی دەرەوەی شا، ئاڵوگۆڕی بەسەردا هات، هەوڵی دا لەگەڵ قانسوور غووری، سوڵتانی میسر نێوانی خۆش بکاتەوە و دانی بە دەسەڵاتدار و حوکمەتی پورتوگاڵ و هۆرمزیدا هێنا، بەشکم بەرەیەکی هاوپەیمان بەدژی دەسەڵاتی عوسمانی ڕێک بخا، بەڵام ئەم ئاواتەشی بردە ژێر گڵ. هەوڵی دا لەگەڵ پاشای هەنگاریا و دێکەنی هیندستان پێوەندیی دۆستانەی هەبێت بەڵکو بە جۆرێک لە بەرەی عوسمانییەکان دایانبڕێ.

بەڵام سوڵتان سەلیم بەم حاڵەشەوە هەر خولیای داگیرکردنی ئێرانی لەسەردا بوو، بە جۆرێک، کە تا ئەو خەیاڵەی وای لێ کرد کاتێک شا سمایل زانیی سوڵتان سەلیم بە سوپاوە بەرەو موسڵ وەڕێکەوتووە، دورمیش خان و زەینەڵ شاملوی لە فیروز کێوەوە ناردە سەر مەراغە و بۆ شەڕی سەلیم خۆی ئامادە کرد.

بەڵام لەو لاوە سوڵتان سەلیم ٢١ی شابانی ٩٢٦ک.م. بەرەو ئەدرنە ڕێی گرتەبەر بۆ ئەوەی پاش پێداچوونەوەیەک بەسەر کاروباری سوپاکەی - وەکوو سەردەمی شەڕی چاڵدێران- لەوێڕا ڕوو بکاتە وڵاتی ئێران. ئەو

پاش وەرێکەوتنی لە ئەستەمبوڵ و بەر لە گەیشتنی بۆ شاری ئەدرنە لە چۆرلی-کە پێشتر گۆڕەپانی شەڕی خۆی لەگەڵ باوکی بوو- نەخۆشی سەر و دڵی گرت و ٨ی شواڵی ٩٢٦ک.م. بەرامبەری ٢٢ی سپێتامبەری ١٥٢٠ ز هەر ئەم نەخۆشییە بڕستی لێ بڕی و بۆ هەمیشە لەکۆڵ شا سمایلی کردەوە.

لەگەڵ مردنی سوڵتان سەلیم، شا سمایل لە چەنگ دوژمنێکی تۆڵەئەستێن و داخلەدڵ و قینلەبەر نەجاتی هات. پاش سەلیم، سلێمانی کوڕی بە کورسیی دەسەڵات خەنی بوو. ئەو تەواوی سەفیر و راسپاردە و دیل و ئەسیرێک، کە باوکی لە بەندی کردبوون ئازاد کردن. بە پێچەوانەی باوکی و هاوڕا لەگەڵ بۆچوونی باپیرانی رووی لە رۆژهەڵات وەرگێڕا. ئەسپی سەرکەشی دەسەڵاتدارییەتی بەرەو رۆژئاوا و حاکمانی تین دا و بلگراد و جزیرە و رووسی داگیرکردن.

شا سمایل نامەیەکی دۆستانەی بە تاجەدین حەسەن خەلیفەدا ناردە دەربارەی سلێمان، پیرۆزبایی گەیشتن بە دەسەڵات و سەرکەوتنی لە شەڕەکانی لێ کرد و بۆ مردنی سەلیمی باوکی خۆی بە خامبار زانی.[١]

سەلیم مردن بوو بە میراتی و ئاواتی لەناوبردن و سڕینەوەی بنە و بنەچەکی سەفەویی بردە ژێر گڵ. شا سمایلیش تا ئەو رۆژەی بەرەو گۆڕ ئاوەژوو بۆوە، ئاشتی و سازانی کردە رێبازی ژیانی و لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ناوچەکان و حاکمانی دەر و جیران پێک هات و هەوڵی دا لەگەڵ خەڵکی ئێران خۆی رێک بخات و کەس لە خۆی زوێر نەکات و ببێتە پارێزەری وڵاتی و رێگە نەدات هیچ زیندەوەرێک خوێنی خەڵکەکەی بڕێژێ.

سەرخۆشی و سەرمەستی بادە و بادەنۆشی بوو بە رێبازی شا. لە کاروباری وڵات و دەسەڵات خۆی دەبوارد و میرزا شا حوسێنی ئیسفەهانیی کە، نزیکەی ٩ ساڵان وەکیل و دەمڕاستی بوو، کردە جێگر و دەسەڵاتداری کاروباری وڵات.

---

(١) فریدون بیگ، ١٣٧٤، هـق، منشات السلاطین، ج اول.

شا سمایل بەهاری ٩٣٠ لە ناوچەی شکی خەریکی راو بوو و لەوێشەوە بۆ زیارەتی مەرقەدی باب و باپیرانی رووی کردە هەردەوێڵ و هەردەوێڵی بە نیازی سەراب بەجێ هێشت و لە گوندی ساین کەوکی سەر بە سەراب نەخۆشی ئاوقای گیانی بوو و خەم و خەفەتی تۆڵەبەزینی چالدێرانی بردە ژێر گڵ.

لەناو شیعەکانی ئەمڕۆی تورکیادا، کە بە عەلەوی دەیانناسن، ئێستاش، کە ئێستایە، شا سمایل هەر لایان خۆشەویست و لەبەر دڵانە. محەمەد ئەمین ریاحی، کە پێنج ساڵان وەکوو بریکاری فەرهەنگیی ئێران لە تورکیا ژیاوە دەنووسێت: (سەرەڕای قەڵتوبڕ و کۆمەڵکوژییەکانی عوسمانی هێشتاش، بە میلیۆن هاوڵاتیی شیعە لە سەرانسەری وڵاتی تورکیا پڕژوبڵاون و شا سمایلیان خۆش دەوێ و هەموو ساڵێک بە نهێنی بە یادی شا سمایل رێوڕەسمێک بەڕێوە دەچێ.[1]

---

(١) ریاحی، م، ١٢٦٨، سفارتنامەهای ایران، تهران، انتشارات توس.

## دەرەنجام:

لەگەڵ ئەوەی سەفەوییەکان پێیاننایە مێژووی ئێرانەوە (٩٠٧ک.م/١٥٠١ز)، شا سمایل بە یارمەتیی قزڵباشان جگە لەوەی لە ئێران ئایینی شیعەی بە فەرمی ناساند، بە هەموو هێز و توانایەوە ملی نا لە قەڵتوبڕ و لەناوبردنی میرانی میرنشینەکانی ئێران، کە دەسەڵاتێکی خۆجێییان بوو و بەو جۆرە، پاش سەردەمێکی زۆر لەبندەستبوونی بێگانە، کە مەترسیی دابەشبوونی وڵاتی ئێرانی بە دواوە بوو، بناغەی سەربەخۆیی دارژا و دەسەڵاتێکی ناوەندگەرا و بەهێز دامەزرا، کە بوو بە دەسپێکی گۆڕانی سیاسیی-مەزهەبی لە ئێران.

لەدایکبوونی دەسەڵاتێکی شیعە مەزهەب لە پەنادەستی بەرەی رۆژهەڵاتی ئیمپراتۆری عوسمانی واتە بەهێزترین حوکمەت، کە خۆی بە داشدار و ئاڵاهەڵگری دنیای ئیسلامی سوننە دەزانی و هەردەمیش چاوی بڕیبووە ناوچەکانی رۆژئاوای ئێران، بوو بە پێکوڵی پێ و چقڵی چاوی عوسمانییەکان. هەر ئەم حەساسیەتەش کوشت و کوشتاری نێوخۆی ئیسلامی بەدواداهات. هەزاران کەسی ئێرانی بە تۆمەتی پێداگری لەسەر ئایینی باب و باپیریان خوێنیان رژا و زیاتر و لە ٤٠ هەزار شیعەی ئاناتۆلیاش هەر بە فەرمانی سوڵتان سەلیم خەڵتانی خوێن کران و ئەو لێک مۆربوونەوە و گرژبوونەوەیە پەرەی سەند و دوایی نەهات. تاکو ئەو دوو ئاڵاهەڵگرەی ئیسلام، لە دەشتی چاڵدێران پێک هەڵپڕژان. سەرەڕای ئازایەتی و جەنگاوەری و بوێری درەوشاوەی فەرماندە و سوپای ئێرانی، بەڵام سوپای عوسمانی بە هێز و توانایی چەکوچۆڵی قورس و دوژمنبەزێن و تاکتیکی کارا و کاریگەری سەربازی، سەرکەوت و تەورێز دیاربەکر و کوردستان بوو بە پێخوستی دەسەڵاتی عوسمانی.

ئەگەر شا سمایل بۆ بانگەشە و پەرەپێدانی ئایینی شیعە، رێبازی سوننەکوشتنی نەگرتبابەر و هەر بە سۆفی و خەلیفەکانی ئاناتۆلیا و بە شێوەیەکی ژیرانە پەرەی بەو ئایینە دابا و، نەیهێشتبا خەلیفەکانی وڵاتی ئاناتۆلیا دنە بدەن، ئەوا رەنگە سەرەڕای توندئاژۆیی و وشکەمەزەبییەکەی

و ئیرادەی شەڕخوازانەی سوڵتان سەلیم، دوو سوپا زلهێزەکەی ئیسلام تووشی شەڕی ناوخۆیی ئیسلام نەهاتبان و ئەو کۆمەڵکوژی و گەلکوژییە رووی نەدابا. ئەگەریش رێگە بەم شەڕە نەگیرابا، بەم حاڵەشەوە شا سمایل هەڕەشەکانی عوسمانییەکانی لەبەر چاو دەگرت لەکاتی خۆیدا شەڕکەر و سوپای ئازا و بەجەرگی لە مورید و پیڕەوانی خۆی کۆ دەکردەوە و بە وردی دەیڕوانییە دیاریکردنی شوێنی شەڕ و تاکتیکی باشتری دەنواند. لەوانەش بوو هەر زوو چارەنووسی شەڕی چاڵدێرانی گۆڕیبا و ئەو ناوچە بەرینانە لە وڵاتی ئێران دانەبڕابان.

شا سمایل هەر لە سەرەتای دامەزراندنی دەسەڵاتەکەی بۆ بنیاتنانی سیستەمێکی ئیداری بەتایبەت تێکەڵبوونی شەڕکەرانی قزڵباش و مەردانی ئێرانی گیروگرفتی هاتە سەر رێ، کە ئەم دژایەتیانە بنەبڕ نەبوون و نەبڕانەوە و هەر ئەوەش رۆڵێکی بەرچاوی بوو لە تێکشکانی سوپای سەفەوییە لە شەڕی غەجدەوان و تەنانەت لە شەڕی چاڵدێرانیش.

شا سمایل سەرەڕای سەرکەوتنی یەکجار زۆر و ملکەچکردنی تەواوی میر و دەسەڵاتدارانی ناوچەکان بە درێژایی ١٣ ساڵ دەسەڵاتدارییەتی، پاش شەڕی چاڵدێران (٩٢٠ک.م/١٥١٤ز) زۆرتری ژیانی دە ساڵەی پاشایەتی لەگەڵ خەم و خەفەتی تێکشکانی ئەو شەڕە مایەوە. دەستەوداوێنی جامی شەڕاب و تیری کەوان بوو و تاکوو ١٩ی رەجەبە مانگی ساڵی ٩٣٠ک. م. واتە ١٥٣٤ز هەر لەکاتی راوکردندا مردن هاتە سەر رێی و بۆ هەمیشە حەسایەوە.

# شکستی چاڵدێران و گۆڕانکاریی پۆستەکانی وەزارەت لە سیستەمی برۆکراسیی ئێرانی سەردەمی سەفەویدا (ساڵی ٩٣٠دا تا ٩٨٤ ک.ز)

مەحسوم قەرەداغی، جەواد ئەبولحەسەنی

**پوختە:**

شکستی شەڕی چاڵدێران لە مێژووی ئێرانی سەردەمی سەفەوی وەکو رووداوێکی زۆر گرنگ سەیر دەکرێت. ئەگەرچی ئەو تێکشکانە نەیتوانی حوکمەتە تازە دامەزراوەکەی سەفەوی تێکەوە بپێچێ، بەڵام نەدامەتی و مەینەتییەکانی دەسەڵاتی قزڵباشان، هەر لەو سەردەمەوە ریشەی داکوتا. بابەت وەکوو لەناوچوونی ئەفسانەی نەبەزبوونی شا سمایل و هەڵوەشانەوە و رەوینەوەی تانوپۆی پێوەندیی نێوان مورید و شێخ و خەلیفە. یان دابڕانی دیاربەکر لە ئێران، کە ویکڕا پاش چاڵدێران سەرودڵی دەسەڵاتی سەفەویی گرت زۆر روون ئاشکران و هیچ پێویست بە لێکدانەوە و شیکردنەوەیان ناکات، بەڵام ئەوش بابەتەی، کە پاش ئەم رووداوە مێژووییە، ئاڵوگۆڕی خستە ناو هەندێک لە پۆستەکانی وەزارەت و سیستەمی حوکمەتەوە، بابەتێکی زۆر گرنگە و رەنگە هەرچەند لەسەر ئەم بابەتە توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی زۆر کرابێت، بەڵام بەم حاڵەشەوە زۆر پەیڤیتر ماوە بۆ لێدوان، کە تاکو ئێستا هیچ قەڵەمێک بەلایدا تێنەپەڕیوە.

ئەوە ئاشکرایە، کە پاش شەڕی چاڵدێران هەلومەرجێکی دیکە باڵی وەسەر ناوەڕۆک و بیچمی دەسەڵاتەکە کێشا. یان بە واتایەکیتر رەوتی کارکردنی هەندێک لە پۆستە ئیدارییەکان گۆڕا و هەر ئەو ئاڵوگۆڕە و ئەو

گۆڕانکارییانە داوێنی (پۆستی وەزارەتیشی) گرتەوە و پۆستەکانی وەزارەت لەو گۆڕانە بێبەش نەبوون. لەو بابەتە هەوڵ دراوە وێڕای هێنانەرووی سەرچاوە و ژێدەر و کتێبگەلێک، کە ئێستا لەبەر دەستدایە، لێکۆڵینەوەیەکیش بکەین لەسەر ڕەوتی دیاریکردنی پۆستەکانی وەزارەت هەر لە پاش شەڕی چاڵدێرانەوە تا کوژانەوەی مۆمی دەسەڵاتی شا تەهماسوبی یەکەم.

**پێشەکی:**

بە درێژایی مێژوو هەر شەڕێک قەوما بێ، جا بە هەر بیانوو نیاز و مەبەستێک بووبێت، دەرەنجامگەلێکی بە شوێن خۆیدا هێناوە، کە ناکرێ حاشای لێ بکرێت. خەسارەتی مرۆیی و کۆمەڵکوژی، وێران و خاپووربوونی شار و گوند و باژێر، سەرهەڵدانی کۆمەڵە نۆرمێکی ڕەفتار و هەڵسوکەوت، بڵاوبوونەوەی هەندێک نەخۆشیی درمی بەشێوەی پەتا و ئاهۆ و لە کۆتاییدا رووخان و لەناوچوونی دەسەڵاتێک و جێگرتنەوەی دەسەڵات و هێزێکی تر، ئەمانەش بابەتی زۆر روون و ئاشکران، کە بە دوای هەر شەڕێکدا، باڵ وەسەر وڵاتەکە دەکێشی.

جا ئیتر ڕەنگە لە کۆتایی شەڕەکە و یان لە وەختی شەڕەکەدا دەسەڵات بۆ مانەوە و پاراستنی خۆی و قەرەبووی زیانەکانی پێشووی، بەسەر سیاسەتەکانی دەرەوەی وڵاتەکەیدا بێتەوە و، ئاڵوگۆڕێک لە سیاسەتی دەرەوەیدا پێک بهێنێ. یان لە ڕێگەی پێکهێنانی بەرەیەکی هاوپەیمان لەگەڵ وڵاتی سێیەم، توانا و دەسەڵاتی خۆی لە ئاست دوژمنانی بەهێزتر بکات، بەڵام لەو ناوەشدا حوکمەت و زنجیرە دەسەڵاتی وا بووە، کە لەگەڵ پێداچوونەوە و گۆڕان لە سیاسەتی دەرەوەیاندا بە ناچار ویستوویانە لە تۆڕە ئیدارییەکان و لە سیستەمی دەسەڵاتەکەیاندا ئاڵوگۆڕ پێک بهێنن. مادام، کە وایە ئەم گۆڕانکارییانە ڕەنگە هەر لەسەر خواستی دەسەڵاتەکە بێت، یان ئەوەیە، کە بەپێی هەلومەرجی نەخوازراو ڕوودەدەن. سەفەوییەکان لە حوکمەتانە بوون، کە پاش شەڕی چاڵدێران تووشی ئەم گۆڕانکارییانە هاتن و بێچم و ناوەرۆکی دەسەڵاتەکە و لە چوارچێوەی کردەوەشدا

هەندێک لە پۆستەکانی دیوانی دەسەڵات گۆڕان. پۆستەکانی وەزارەت یەک لەم کورسییانە بوون، کە پاش شەڕی چاڵدێران ئاڵۆگۆڕیان بەسەردا هات. لێکدانەوەی ئەو دەستکەوتەی شەڕی چاڵدێران بابەتی ئەم دەقەیە.

## شیکردنەوەی مێژووی پۆستەکان لە دەسەڵاتی سەفەویدا:

لە بابەت پۆستە ئیدارییەکان و پۆستەکانی وەزارەت، کە لە سیستەمی دەسەڵاتی دەربارییی ئێراندا رەگ و ریشەیان داکوتاوە، لە ناوخۆی وڵاتی ئێران توێژینەوەیەکی شایان نەکراوە. تەنیا لە نێو توێژەرە بیانییەکاندا، هێربێرت بوسە و راجێر سیوری بەپێی بەڵگەنامەکانی ئاق قۆیونلو و سەفەوی سەبارەت بە پۆست و کورسییەکانی ناو دەسەڵات زۆر زانایانە و بەتێروتەسەلی توێژینەوەیان کردووە[١].

بەپێی وتەی سیوری، سەفەوی‌ناسی تێگەیشتووی ئەوروپایی، پۆستەکانی وەزارەت رەنگە بەرهەمی تەیموورییەکان بێت و هەر لە سەردەمی شاڕوخ کوڕی تەیموەوە، وەزارەت، پۆستێکی تەواو سەقامگیر بووە و رەنگە هەر ئەو سەردەمی تەیموریش ئەو پۆستانە لەناو دەسەڵاتدا بووبێتن، [٢] کەوایە پۆستی وەزارەت بە پێچەوانەی پۆستی وەک مەلا

---

(١) بۆ نموونە دەکرێ ئاماژە بەمانە بکرێت:

بوسه، هربوت، پژوهشی در تشکیلات دیوان اسلامی، بومبنای اسناد دوران آق قویونلو و قرا قویونلو و صفوی، ترجمه غلامرضا ورهرام، ج اول، تهران، موسسه مطالعات و تحقیقات فرهنگی، ١٣٦٧، ص ص٢١٤-٢١٠.

لمیتون، ان: نظریه دولت در ایران، ترجمه چنگیز پهلوان، کتاب ازاد، تهران، ١٣٥٩.

Sadr in: Encyclopaedia of Islam. 2ed, p.746-751.

بۆ زانیاری زیاتر لەسەر توێژینەوەی بیانییەکان سەبارەت بە پۆستەکانی وەزارەت و کارەکانیان ئەمانە بخوێننەوە. صفت گل، منصور، ساختار نهاد و اندیشه دینی در ایران عصر صفوی، ج اول، تهران، موسسه خدمات فرهنگی رساء، ١٣٨١، صص٤٧٦ و ٤٧٧.

(٢) سیوری، راجر، تحقیقاتی در ایران عصر صفی (مجموعه مقالات)، ترجمه عباسقلی غفاری فرد، محمد باقر ارام، ج اول، تهران، ایمر کبیر، ١٣٨٢، صص١٢٥ و ١٢٦.

باشی-کە داهێنانی سەفەوی بوون- لە سەردەمی تەیموورییەکانیش هەر لەناو دەسەڵاتدا هەبوون و بەڕاستی لەم بابەتەوە سەفەوییەکان دەیندارى تەیموورییەکانن.

سەدر (وەزیر) لە سەردەمی سەفەویدا، بەرپرسی دامەزراوەی دینی بووە و لە زەمانی شا سمایلی یەکەمدا لە توێژی سەید و شێخە زاناکان هەڵدەبژێردرا. ئەو کەسانە زۆرتر سەر بە مەکتەبی شیراز بوون و لە دوا شاگردانی دوانی و خانەدانی دەشتەکی و هەندێکیشیان ئێسترئابادی بوون.[١]

یەکەم کەس کە ئەو پۆستەی پێ سپێردرا، قازی شەمسەدینی جیلانی (گیلانی) بوو. خواندەمیر دەنووسێت: (قازی شەمسەدین پێی نایە دەرباری شا و کورسیی وەزارەتیان دایە و سەرە هەودای کاروباری وڵاتی لە مشتی خۆی ناو رێگەی بۆ ملکەچبوون لە ئاست دەسەڵاتی ئایینی خۆش کرد)[٢]. ئەوەی دەبێتە هۆ زیاتر سەرنج بدەین بە پۆستی وەزارەت و رەوتی کاروبارەکەی لە سەردەمی دەسەڵاتدارییەتی سەفەوییەکان، ئاڵوگۆڕ و گۆڕانێکە، کە بە درێژایی ژیانی دەسەڵاتدارییەتی پاشاکانی سەفەوی لە ناوەڕۆک و بێچمی ئەو زنجیرە دەسەڵاتە هاتووەتە دی. بە واتایەکی تر چونکە دەسپێکی سەردەمی دەسەڵاتدارییەتی سەفەوییەکان لە ئێراندا، سەرەتای قۆناغێکی نوێ بوو لە مێژووی سیاسی- ئایینیی ئێران، لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو گۆڕانکارییانەی لەناو دەسەڵاتی دیوانسالاری (برۆکراسی) و لە پێکهاتە و بیچمی دەسەڵاتی دیوانسالاری ئایینیدا روویدا، کاریگەری لەسەر پێکهاتەی دەسەڵاتی دەرباریی ئایینی دانا، کە گۆڕانی پێکهاتەی دەسەڵاتی سیاسیشی لێ کەوتەوە. ئەم کاریگەرییە لەبەر ئەوە زەق و

---

(١) جعفریان رسول: صفویه در عرصه دین، فرهنگ و سیاست، ج اول، ج١، قم انتشارات پژوهشکده حوزه و دانشگاه، ١٣٧٩، ص١٩٥.

(٢) خواندمیر، غیاث الدین: تاریخ حبیب السیر، به کوشش جلال همایی، چ سوم، ج٤، تهران، خیان، ١٣٦٢، ص ٤٦٨.

بەرچاو بوو، کە سەفەوییەکان وەکو دەسەڵاتدارانی پێشوو تەنیا سەودای پاوانکردنی دەسەڵاتی سیاسییان لەسەردا نەبوو و تەوەری دەسەڵاتەکەیان پابەند نەبوو بە پێوەندییە عەشیرەتییەکان و بەڵکو بەرزتر لەمە دەیڕوانییە دەسەڵات. ئەو شێوە رەفتارە بوو بە دیاردە لە مێژووی سیاسیی ئێراندا. سەفەوییەکان زۆرتر قورساییان خستبووە سەر لایەنی ئایینی و هەر ئەوەش ئەوانی لە بۆچوونی دەسەڵاتی عەشیرەیی و شێوە دەسەڵاتێک، کە بە میرات دەگوازرایەوە، جیا دەکردەوە.[1] بەگشتی پۆستی وەزارەت لە سەردەمی دەسەڵاتی پاشاکانی سەفەوی رەوتێکی نەگۆڕی نەگرتەبەر، بەڵکو بە درێژایی ئەم دەسەڵاتە ئاڵوگۆڕ و هەڵکشان و داکشانی زۆری بەخۆوە دیت. تاکو شەڕی چاڵدێران و چەندین ساڵ پاش دەسەڵاتی شبا تەهماسوبی، وەزیرەکانی سەفەوی هەر لە تیرە و توورەمەی شێخ و مریدەکان بوون، کە بە بنەچەک دەگەیشتنەوە سەر تۆرەمەی سەیدەکانی ئێران. لە حاڵێکدا پاش تێپەڕبوونی سەردەمێکی زۆر لە شەڕ چاڵدێران، وەک چۆن بە تێروتەسەلی باسی دەکەین، هەندێ جار سەید و شێخە عەرەبەکانیش ئەم پۆستەیان لە ئەستۆ گرتووە. خاوەن دەسەڵاتەکانی پۆستی وەزارەت تاکوو شەڕی چاڵدێران، جگە لەوەی رۆڵی ئایینی و مەزهەبیی دەسەڵاتەکەیان دەگێڕا، لەناو گۆڕەپانی سەربازیی دەسەڵاتیشدا رۆڵێکی بەرچاویان بوو، بەڵام پاش شەڕی چاڵدێران بۆ کاروباری سەربازی و شەڕ پرسیان پێ نەدەکرا و ئەرکی سەرشانیان بەرتەسک بۆوە و تەنیا چاودێری بەسەر کاروباری شەرعی و سەرپەرشتیاری ئەوقافیان پێ دەسپێردرا.

بەپێی وتەی بوداق قەزوینی، کە مودیر بووە لە دەرباری شا سمایل: پاش شکانی شیبەک خانی ئۆزبەک، لە رێی گەڕانەوەیان لە خۆراسانەوە بۆ عێراق، بە فەرمانی شا سوپا لە زۆزانی قوم لەشکربەزی کرد و هەر ئەودەمی میر عەبدولباقی یەزدی، کە لە شێخەکانی ئێران بوو پۆستی

---

(١) صفت گل، همان، ص٤٣٢.

وەزارەتی پێ سپێردرا[1] و، سی ساڵ دواتر ساڵی ۹۱۹ک.م.، کە ئۆزبەک هەڵیانکوتایە سەر خۆراسان و کردیانە رمبازێنی ئەسپی ئۆزبەک و تاڵانوبڕۆیان خستە شار. (شا سمایل، کە ئەودەمی لە ئیسفەهان خێوەتی هەڵدابوو بەرە و خۆراسان وەڕێ کەوت و لە ساروقمیش، میر عەبدولباقی کردە وەکیل و دەمڕاستی و میر سەید شەریفیشی لەسەر کورسیی وەزارەت دانا).[2]

خاوەن کورسییەکانی وەزارەت تا سەردەمی چاڵدێران، کە هەندێکجار بۆ پاراستنی ئاسایش و بەرگری کردن لە تێکهەڵچوونی سەربازی کۆ دەبوونەوە، بەشداربووی ئەم کۆڕ و کۆبوونەوانە بوون بۆ ئەوەی بۆ کەمکردنەووەی تەنگەژە و گرژی نێوان دەسەڵاتی سەفەوی و نەیارانی، لە جێگە و پێگەی لایەنی رۆحیی خۆیان کەڵک وەربگرن. وەک چۆن سەید مەحمووی کمونە، کە یەک لە سێ سەیدە کوژراوەکەی چاڵدێران بوو، بۆ ئەوەی رێگر بێت لە تێک هەڵچوونی دوو سوپای بایرک سوڵتانی دەسەڵاتداری بەغدا[3] و شا سمایل، رێگەی وتووێژی خۆش کرد. نووسەری مێژووی سەفەوی لەم بابەتەوە دەنووسێت: (چونکە سەید محەمەدی کمونە کلیلی باغی بەهەشتی بەدەستەوە بوو، گوتی: شەهریار ئەگەر لەگەڵ شا سمایلی شەڕکەر سازابای، بەخوا هەر بە قازانجی خەڵکی بێتاوان و لێقەوماو تەواو دەبوو. ئەو وڵامی داوە: سەید (لادەر) بۆ من نازانم تۆ لادەری، من لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانە دانوم ناکوڵێ و هیچ کات حەزم لێیان نەبووە جا دواتر بزانە چۆن شمشێر لە کالان دەردەکێشم و تەفروتونایان

---

(۱) بوداق منشی قزوینی: جواهر الاخبار، با مقدمە، تصحیح و تعلیقات محسن بهرام نژاد، ج اول.

(۲) هەمان، ص۱۳۲.

(۳) نووسەری کتێبی احسن التواریخ ناوی بایرک سوڵتانی بە باریک پرناک هێناوە بۆ زانیاری زۆرتر: حسن بیگ روملو، احسن التواریخ، تصحیح و تحشیە عبدالحسین نوایی، چ۱، ج۱، تهران، اساطیر، ۱۳۸٤، ص۱۰۳۱.

دەکەم. پاشان وتی ، ئەو سەیدە قۆڵبەست بکەن و بیخەنە بەند با وڵامی قزڵباشان بدەمەوە و تێیان گەیەنم. ئەوکات ئازادی دەکەم چونکە دڵم لەو سەیدە ناحەسێتەوە)[1].

جا ئێستا ئێمە نامەنەوێ بزانین، کە ئایا خۆتێهەڵقوتانی وەزیرەکانی سەفەوی زۆرتر چارەسەی کێشەکەی کردووە یان هەروەک ئەو جۆرەی باسمان کرد هیچ دەستکەوتێکی نەبووە. ئەوەی بەلامانەوە گرنگە ئەوەیە، کە بازنەی ئەرک و بەرپرسایەتییەکانی خاوەنی پۆستی وەزارەت لە بیست ساڵەی سەرەتای سەفەویدا لە چاو ساڵەکانی دواتر بەرینتر بووە. ئەو جۆرە دەسەڵاتەش زۆرتر لە شێوە دەسەڵاتی ئایینسالاریی سەرەتاکانی سەفەوی هەوێنی گرتووە. بەو جۆرە لێکدانەوەیە پێ دەچێ لە سەردەمی شا سمایلدا هەندێک ململانی و لێکمۆڕبوونە لە نێوان ئەندامانی دەسەڵاتی دیوانسالاریدا بووبێت و ئەو ململانێیە جاری وابوو ئەوەندە پەرەی سەندووە، کە شا سمایلی ناچار کردوە کاردانەوەیەکی جیدی هەبێت لەسەر بابەتەکە. سەبارەت بە قازی محەمەدی کاشانی، کە وەزیری شا سمایل بوو، کاتێک هەوڵی دا میر نەجمەدین بە گەندەڵی تۆمەتبار بکا، شا سمایل لە قازی محەمەدی کاشانی قبووڵ نەکرد، تەنانەت فەرمانی کوشتنی میر نەجمەی دا و پاش میر نەجمە، میر شەریفەدینی کردە بەرپرسی پۆستی وەزارەت، کە لە نەوەو نەتیژەکانی سەید شەریفەدینی عەلی جورجانی بوو.[2]

هەرچەند قازی محەمەدی کاشانی بە کوشت چوو، بەڵام هێشتاش ململانێی نێوان ئەندامانی دەسەڵاتی دیوانسالاری بەتایبەت خاوەن کورسییەکانی وەزارەت بنەبڕ نەکرا. وەک چۆن مێژوو دەڵێ ساڵی

---

(١) عالم آرای صفوی، به کوشش یدالله شکری، انتشارات بنیاد فرهنگ ایران، ص١٢٤.

(٢) قازی محەمەدی کاشانە لە وەزیرەکانی شا سمایل بوو. ئیدیعای ئەمەی دەکرد کە میر نەجمەدین ٢٠ هەزار تمەنی لە ماڵ و سامانی شا داگیرکردووە و رایگەیاندبوو کە ئەگەر میر نەحمەی بخەنە بەر دەستی ئەوا ئەم پارە دزراوە دەگەڕێنێتەوە دەربار. بۆ زانیاری زۆرتر: حبیب السیر، ج٤، ص ص٤٩٩ و ٥٠٠.

٩٢٠ک.م/١٥١٤ز واته ساڵی شەڕی چاڵدێران، میر (عەولای) لالە، کە لە تۆرەمەی بەرەبابی لالە بوو و شێخی تەریقەتی کەبرویەی ئازەربایجان بوو، بۆ ماوەیەکی کورت ئەم پۆستەی پێ سپێردرا[١] (پۆستی وەزارە)، بەڵام دەریان کرد: (لەبەر ئەوەی ئەرکی خۆی بە تەواوی بەڕێوە نەدەبرد و هیچی لە دەست نەدەهات، میر جەلالەدینی محەمەدی ئیسترئابادی جێی پڕ کردەوە.[٢] میر جەلالەدین تا ساڵی ٩٣١ک.م. هەر لەسەر ئەم پۆستە مایەوە. لەم ماوەیەدا، کە نزیکەی بیست و چەند ساڵێک لە تەمەنی دەسەڵاتی سەفەوی کەم بۆتەوە، کورسیی وەزارەت بێجگە لەوەی دەبوو ئەرکی سەرەکیی خۆی-کە چاوەدێری بەسەر کاروباری ئایینی بەتایبەت سەرپەرشتی ئەوقاف- بەڕێوەبەرێ، کاروباری سەربازیشی بەئەستۆ بوو. کتێبی مێژوو (خلاصە التواريخ)ی قازی ئەحمەدی قۆمی سەبارەت بە شێوەی ئارایشی سوپای شا سمایل و بەشداربوونی چەندین سەید، کە هەرکامەیان ماوەیەک ئەرکی پۆستی وەزارەتیان لەسەر شان بووە بەم جۆرە دەدوێ:(...و لەسەر فەرمانی خاوەنشکۆ، باڵی راستی سوپا بە میرانی مەزن وەکو دورمیش خان شاملو و خەلیل سوڵتان زولقەدر و وسێن بەگولا و نوور عەلی خەلیفەی روملو و خولەفا بەگ سپێردرا و سەرکردایەتی چەپەنگیش، لە دەستی خان محەمەدی ئیستانجلو و چایان سوڵتان و سەربازانی دیاربەکر بێت و میر عەبدولباقی و سەید کمونە و میر سەید شەریف با لەناو دڵی لەشکردا بن و...).[٣]

لە جەنگەی شەڕی چاڵدێران زۆر لە میران و سەرکردەی سوپا و سەید گیانیان بەخت کرد، کەسانێکی وەکو میر عەبدولباقی و میر محەمەدی کمونە و

---

(١) احسن التواريخ، ص١٩٧.

(٢) هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

(٣) قاضی احمد قمی، خلاصە التواريخ، تصحيح احسان اشراقی، تهران، انتشارات دانشگاه، تهران، ص١٣٠.

میر سەید شەریف.[1] ئەوەی ڕاست بێ شەڕی چاڵدێران دوایین شەڕێک بوو، کە وەزیرەکانی سەفەوی لە ریزی سوپادا بوون. هەربۆیە پاش چاڵدێران، کاربەدەستانی وەزارەت بەگشتی ڕێگەی مەیدانی شەڕیان لێ گیرا و بەو جۆرە یەکەم گۆڕان و ئاڵوگۆڕ لە کاروباری کورسییەکانی وەزارەت، دەستکەوتی شەڕی چاڵدێران بوو. دە ساڵ پاش تێکشکانی چاڵدێران، لە دەوروبەری سەرابی سەر بە ئازەربایجان مردن تەنگی بە شا هەڵچنی و لە دوای خست و لەگەڵ هاتنی تەهماسوب بۆ ناو دەربار، پۆستەکانی وەزارەت ئەوەندەی دیکەش گۆڕا. یەک لەو گۆڕانانە لە پلەی وەزیردا بوو، کورسیی وەزیر لەو سەردەمەدا بوو بە پۆستێکی هاوبەش. لەچاو سەردەمی شا سمایل و بەتایبەت لە چاو سەردەمی بەر لە شەڕی چاڵدێران، جێگە و پێگەی ئەو پۆستە، چڕژی بەست و ئەو دەسەڵاتەی جارانی لێ بڕا. یەک لە هۆکارەکانی هاوبەش بوونی پۆستی وەزیر ڕەنگە لە بەرین بوونەوەی سیستمی دەرباری سەفەوییەکانەوە بێ، بەتایبەت، جیاوازی و فەرقێک، کە وردەوردە لە نێوان ئەوقافی پاشایەتی و ئەوقافەکانی تر سەری هەڵدا. میر جەماڵەدینی ئسترئابادی، کە ساڵی یەکەمی پاشایەتیی شا تەهماسوب، لەسەر ئەو پۆستەی هەر مابۆوە. دەستبەجێ بەشدارێکی بۆ خۆی دۆزییەوە. چونکە  ساڵی ٩٣١ک.م. (لە پێداچوونەوەیەکی قازی جەهان حەسەنی وەزیری یەکەم، بۆ کاروباری وەزارەت میر قوامەدین وسێنیان ڕەگەڵ میر جەمالەدین خست).[2] میر جەمالەدین نانی لەو پۆستە نەخوارد و مردن بەرۆکی گرت و،  پاش ئەو میر نێعمەتوڵاعەلی و میر غیاسەدین مەنسووری شیرازی بوونە بەشداری ئەم پۆستە.[3]

---

(١) احسن التواریخ، ج٢، ص١٥٨٨، خلاصه التواریخ، ص١٣١. تاریخ عالم آرای عباسی، ج١، ص٤٣.

(٢) عبدی بیگ شیرازی، زین العابدین، تکلمه الاخبار، به کوشش عبدالحسین نوایی، تهران، نشرنی ١٣٦٩، صص ٦٠ و ٦١، خلاصه التواریخ، ص١٦٥.

(٣) خلاصه التواریخ، ج١، ص١٩٥.

رەنگە پلەی وەزارەت لە سەردەمی تەهماسوبی یەکەم ساڵی ٩٤٠ ک.م زیاتر لە هەر وەختێکیتر ئاڵۆزا بێت. واتە ئەو ساڵەی، کە عەلی کوڕی وسێن کوڕی عەبدولعال ناسراو بە (موحقێق کەرەکی) -لەو زانایانەی جەبولولعامل- هاتە نێو مەیدانی سیاسی و سیاسەتی ئایینیی سەفەوییەکان و وردەوردە کەوتە بەر دڵی شا تەهماسوبەوە. دیارە کەرەکی نەیدەتوانی لەگەڵ وەزیرانێک، کە هەڵقولاوی بیرۆکەی ئێرانییەکان بوو و لە بواری ئاییندا زانستێکی ئەوتۆیان نەبوو هاودەنگ و هاوڕا بێت، هەربۆیە تەهماسوبی تین دا. فکر و بۆچوونەکانی کەرەکی کاری کردە سەر تەهماسوب و کەرەکیش بەمەی دەزانی. شا جاڕی دا لەجیات زانایانێک، کە پسپۆڕی بواری زانستی کەلام (Theology) و فەلسەفە بوون دەبێ کەسانێک بەرپرسیاری کاروباری شەرعی ببن کە مافناسی بواری ئایینین. هەر لەسەر ئەم شێوە بیرکردنەوەیە بوو، کە کەرەکی بە ئاواتی خۆی گەیشت و میر غیاسەدین مەنسووری لە مەیدانی دەسەڵات کلا کرد.

نووسەری عالەم ئارای عەباسی دەڵێت:

(پاش مردنی میر قەوامەدین حەسەن عەلامەلعولەمائی، میر غیاسەدین مەنسووری شیرازی و میر نیعمەتوڵلا عەلی بە دوو قۆڵی ئەرکی وەزارەتیان بەڕێوە دەبرد و چونکە میر نیعمەتوڵلا لەگەڵ خاتەمولموجتەهیدین شێخ عەلی عەبدولعالی دانوی نەدەکولا و بەلام لەگەڵ شێخ برایمی قەتیفی دەسازا، کە شێخ برایمیش دوژمنی خاتەمولموجتەهەدین بوو، پۆستی وەزارەتیان لێ ئەستاندەوە و بەرەو حیلە بارگە و بنەی پێچاوە، بەلام ئەویش لەگەڵ خاتەمولموجتەهەدین هەر لێک مۆڕ دەبوونەوە. سەرەنجام نێوانیان تێک چوو. میر ئەوی بە نەزانی تۆمەتبار دەکرد و، میرزاش تۆمەتی لادان لە قانوونی دەخستە پاڵ میرەوە. رۆژێکیان لە خزمەت شادا باسێکی زانستیی هاتە گۆڕێ، باسەکە هەر نەبڕایەوە و وردەوردە لێیان بوو بە شەڕ و چەلەحانێ، شەڕەکە نەبڕایەوە و شا بوو بە نێوبژیوان، بەلام لای خاتەمولموجتەهەدینی گرت و

میرزای لەسەر کار دەرکرد.[1] وەک چۆن لە نووسراوەکانی ئەسکەندەر بەگی تورکەمانیش هەر ئەمە دەردەکەوێ، کە فکر و بیرۆکەی کەرەکی بەیەکجاری باڵی وەسەر هزری شا تەهماسوبی سەفەوی کێشابوو و کەرەکیش، کە پشتی بە شا تەهماسوبەوە گەرم بوو بێ لێپرسینەوە و بێباکانە خەریکی ئاڵوگۆڕی کورسیی وەزارەت بوو و بەپێی وتە حەسەن بەگی روملو، دەرکردنی میر غیاسەدین مەنسوور لە دەربار و هەڵبژاردنی میر موعەزەدین هەر لەسەر قسە و پێشنیاری موحەقەقی کەرەکی بوو.[2] بەم جۆرە ململانێیەکی یەکجار گرژ و توند لە نێوان موحەقەقی کەرەکی و هەندێک لە سەیدەکانی ئێران، کە زۆرتریان بەرپرسی کورسییەکانی ناو دەربار بوون هاتە ئارا و گەورە دەسەڵاتدارانی ناو دەربار لە ئاست هێز و دەسەڵات و پێگەی موحەقەق کەرەکی-کە ببووە دمڕاست و کەیخودای شا و دەربار- نەیانتوانی خۆ بگرن و بەزین. وەک چۆن پێشتریش ئاماژەی پێ کرا، کە موحەقەق کەرەکی لەناو دەربار‌دا بۆ دەرکردن و دیاری کردنی پۆستەکانی دەربار زۆر شتی لەدەست دەهات.

بەم جۆرە پۆستەکانی دەربار ئیتر ئەو جێگە و پێگەیەی سەردەمی شا سمایلییان نەما و بەتایبەت لەو کاتەوە شا تەهماسوب نازناوی شێخولئیسلامی دا بە کەرەکی، ، کە بۆ یەکەمجار بوو ئەو نازناوە لەلایەن شا تەهماسوبەوە بە کەرەکی بدرێت و بەدوای ئەم فەرمانەی شا، دیاری کردنی پۆستەکانی دەربار کەوتە بەر دەستی پۆستی شێخولئیسلام. کەچی هەر لە سەرەتاکانی دەسەڵاتی سەفەوی و بەر لە هاتنی کەرەکی بۆ ناو دەربار هیچ کام لە ئەندامانی حوکمەتی سەردەمی سەفەوی ئەو نازناوەیان پێ نەبەخشرا.

کورتەی کەلام دەکرێ ئاڵوگۆڕی پۆستەکانی دەربار هەر لە شەڕی چاڵدێرانەوە تا کۆتایی دەسەڵاتەکەی شا تەهماسوبی یەکەم بەم جۆرە ببڕینەوە کە:

---

(١) اسکندر بیگ ترکمان: تاریخ عالم آرای عباس، چ دوم، ج١، تهران، امیر کبیر، ١٣٥٠، ١٤٤.

(٢) احسن التواریخ، ج٣، صص ١٣٣١ و ١٣٣٣.

١- پاش شەڕی چاڵدێران، مەیدانەکانی شەڕ بۆ خاوەنانی پۆستی وەزارەت قەدەغە کرا و ئەرکی راسپێراوییان بەرتەسک بۆوە و تەنیا بەڕێوەبردن و راپەڕاندنی کاروباری ئایینیان پێ دەسپێردرا. کەچی پێشتر بەپێی ژێدەرەکان، هەندێک لە سەیدەکانی ئێران، کە بەرپرسی وەزارەت بوون لە شەڕی چاڵدێرانیشدا بوون و لە بەرامبەر سوپای سوڵتان سەلیم خۆیان بەکوشت داوە.

٢- تا ئەوکاتەی شەڕی چاڵدێران رووی دا، پۆستی وەزارەت لەبەر سروشتی دەسەڵاتە ئایینییەکەی سەفەوی لە چاو ساڵەکانی پاش شەڕی چاڵدێران، جێگە و پێگەیەکی بەهێزی بوو لەناو دەسەڵاتدا. ئەگەرچی لەگەڵ قوتبوونەوەی موحەقەق کەرەکی لە سیستەمی دەسەڵاتی سەفەوی و گەیشتنی بە پلەی شێخولئیسلام، پۆستی وەزارەت کەوتە بەردەستی شێخولئیسلام.

٣- تاکو شکستی چاڵدێران و تەنانەت زیاتر لە دە ساڵ پاش ئەم شکستە، پۆستی وەزارەت بە تەنیا بەر عۆدەی کاروبار و ئەرکی خۆی بوو، بەڵام لە ساڵەکانی دواتردا، ئەم پۆستە بە دوو قۆڵی بەڕێوە دەچوو.

٤- لە سەرەتاکانی دامەزرانی دەسەڵاتی سەفەوی، خاوەنانی پۆستی وەزارەت هەر لە سەیدە ئێرانییەکان هەڵدەبژێردران، بەڵام وردەوردە لە سەردەمی شا تەهماسوبی یەکەم بەو لاوە، سەیدە عەرەبەکانیش بوونە عۆدەداری ئەو مقامە، بۆ وێنە حلی. ئەگەرچی ئەو گۆڕانە لە سەردەمی شا عەباسی یەکەمدا زۆر خێراتر رەنگی بەخۆوە گرت.

کورتەی کەلام ئەوەیە، کە لێکدانەوەیەکی زانستیانە سەبارەت بە گۆڕانکارییەکانی پۆستی وەزارەت لەناو سیستەمی دەسەڵاتی سەفەوی هەر لە تێکشکانی شا سمایل لە چاڵدێرانەوە تاکو ئاوابوونی دەسەڵاتی شا تەهماسوبی یەکەم، پێویستی بە سامانی تێگەیشتنێکی زۆرتر و دەرفەتی گونجاوە. بەو هیوایەی ئەم کورتە باسە لەلایەن زانایان و بیرمەندان تەنیا وەک روونکردنەوەیەک چاوی لێ بکرێ.

**سەرچاوەکان:**

١- خواند میر، غیاث‌الدین: تاریخ حبیب السیر، به کوشش جلال همایی، چ سوم، ج٤، تهران، انتشارات خیام، ١٣٦٢.
٢- بوداق منشی قزوینی: جواهر الاخبار، با مقدمه، تصحیح محسن بهرام نژاد، چ اول، تهران، مرکز نشر میراپ مکتوب، ١٣٧٨.
٣- حسن بیگ روملو: احسن التواریخ، تصحیح و تحشیه عبدالحسین نوایی، چ اول، تهران، انتشارات اساطیر، ١٣٨٤.
٤- قاضی احمد قمی، خلاصه التواریخ، تصحیح احسان اشراقی، تهران، انتشارات دانشگاه تهران.
٥- عالم آرای صفوی: به کوشش یدالله شکری، تهران، انتشارات بنیاد فرهنگ ایران، ١٣٥٠.
٦- عبدی بیگ شیرازی، زین العابدین: تکمله الاخبار، به کوشش عبدالحسین نوایی، نشرنی، ١٣٦٩.
٧- اسکندر بیگ ترکمان: تاریخ عالم آرای عباسی، ١ دوم، ج١، تهران، انتشارات امیر کبیر، ١٣٥٠.
٨- سیوری، راجر: تحقیقات در تاریخ ایران عصر صفوی (مجموعه مقالات)، ترجمه عباسقلی غفاری فرد، محمد باقر ارام، چ اول، تهران، انتشارات امیر کبیر، ١٣٨٢.
٩- صفت گل، منصور: ساختار نهاد و اندیشه دینی در ایران عصر صفوی، چ اول، تهران، مؤسسه فرهنگی رسا، ١٣٨١.
١٠- جعفریان، رسول: صفویه در عرصه دین، فرهنگ و سیاست، چ اول، ج١، قم، انتشارات پژوهشکده حوزه و دانشگاه، ١٣٧٩.

# شەڕی چاڵدێران و سیاسەتی دەرەوەی سەفەوییەکان

پاشا عەلیپور- شاناز مرادی قەرەقشلاقی- تاهیرە حەسومی

**پوختە:**

لە مێژووی ئێراندا، چاڵدێران یەکجار زۆر گرنگە. لەلایەکەوە، لەبەر ئەوەی شا سمایل داوای لە گشت نەتەوە و هۆزەکانی ئێران بۆ وێنە، گیلەکی (گیلان)، کورد، لوڕ، بەختیاری، ئازەری، بەلوچ، خوزی (عەرەبی خوزستان) کرد کە یارمەتیی بدەن پاش نزیکەی هەزار ساڵ ئێرانێکی تۆکمە و یەکپارچەی ساغ بکاتەوە، لەلایەکی تریشەوە لەبەر ئەوەی لە شەڕی چاڵدێراندا، هیچ کەسێکی ئێرانی نەکەوتە بەر دەستی دوژمن و بەدیل نەگیرا (؟؟وە) و هەموویان تاکو دواین هەناسەی ژیانیان بەرەنگاری دوژمن بوونەوە و خۆیان بەکوشت دا. ئێرانییەکان لە شەڕی چاڵدێران حەماسەیەکیان خوڵقاند، کە تاکو ئێران بمێنێتەوە، ئازایەتیی چاڵدێرانیش هەر زیندووە. لە شەڕی چاڵدێراندا شا سمایل لەبەر نەبوونی چەکوچۆڵی قورس و دوژمنبەزێن (تۆپ و تفەنگ) و نەبوونی هێزێکی چەکداری نەتەوەیی (نا عەشیرەتی) تێک شکا و، سوڵتان سەلیم تەنیا دەستی گەیشتە ئاواتی خۆی، ئەویش داگیرکردن و وەسەرخستنەوەی ناوچە کوردنشین و تورکماننشینەکان بوو بۆ سەر قەڵەمڕەوی عوسمانی. ئەو ئاواتە کۆنەی، ئێستا بۆتە قەیرانێک و داوێنی تورکیای گرتۆتەوە و لەگەڵ

سەربەخۆخوازیی کوردەکان ململانێیەتی[1]. سوڵتان سەلیمی یەکەم پاش سەرکەوتنی لە شەڕی چاڵدێران بەرەو تەورێز پێشڕەویی کرد و چوارەمی سێپتەمبەر (١٤ خەرمانان) گەیشتە تەورێز، بەڵام لەبەر خۆڕاگریی خەڵک و شەڕ و پێکدادانی هێزە خۆجێییەکانی وەفادار بە شا سمایل ناچار پاشەکشێی کرد.

شا سمایل تا سەردەمی شەڕی چاڵدێران، دژی بەکارهێنانی چەکی گەرم بوو. ئەو جۆرە چەکەی وەکو چەکێکی کۆمەڵکوژ سەیر دەکرد و بە پێچەوانەی ڕێوشوێنی جوامێرانی دەزانی و بە چەکی حیزبگیر و خوێڕی-سیفەت دەیناسی. سەرەڕای ئەوەش، زۆرتری سوپاکەی عەشیرەتە قزڵباشەکان بوون و سوپایەکی چەکداری نەتەوەیی نەبوو، کە تێکەڵێک بێت لە خەڵکی گشت ناوچەکانی ئێران.

شەڕی چاڵدێران بە درێژایی مێژوو گەورەترین و مەزنترین شەڕی شمشێر بە تفەنگ بوو. هەر ئەزموونی ئەو شەڕە یەکیەتی سۆڤێتی هێنایە سەر ئەم رایە، کە ساڵی ١٩٤٩ بۆمبی ئەتۆمی و ساڵی ١٩٥٣ بۆمبی هایدرۆژنی و ساڵی ١٩٥٧ مووشەکی دوورهاوێژ دروست بکات و هەر ئەو ئەزموونەش وڵاتانە بێبەش لەو چەکانەی هێنایە سەر ئەم بیرۆکەیە، کە لە هەوڵی بەدەستهێنانیدا بن. چونکە ڕێکخراوی نێونەتەوەیی ئەو جۆرەی، کە دەبوو لە دەستی بێت تا ئێستا نەیتوانیوە ڕێگر بێت لە شەڕ و کۆمەڵکوژی و نەیتوانیوە ببێتە داشدار و لەمپەری وڵاتانی بچووک و بێ‌هێز.

لەم وتارەدا تیشک دەخەینە سەر پێوەندیی دەسەڵاتی سەفەوی بەتایبەت لە سەردەمی شا سمایلی یەکەم لەگەڵ وڵاتانی دەرەوە و کاریگەرییەکانی ئەو پێوەندییانە لەسەر شەڕی چاڵدێران.

---

(١) ئاخر دەسەڵاتی ئێران ئێستاش پێی وایە کە کورد لە فارس بۆتەوە و ئەگەر کوردی باکوری کوردستان تەنگی بە دەسەڵاتەکەی هەڵچنیوە ئەوا لەبەر ئەوەیە کە بە زۆری ئەو وڵاتەی داگیر کردووە. زۆر سەیرە (وە)

## پێشەکی:

ڕۆژی یەکەمی خەرمانانی هەر ساڵێک ساڵوەگەڕی قارەمانیەتیی نەتەوەیی ئێرانییەکانە لە چاڵدێران. چوارسەدونەوتوچوار ساڵ لەمەوبەر (ئەم وتارە ٥ ساڵ بەر لە وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی کوردی نووسراوە)، هاوارێک لە ویژدانەوە سەری هەڵدا، ئەو هاوارەی چیرۆکێکی هەرمانی لەگەڵ خۆی هێنا. هاوارێک، کە راستەوە ببوو بۆ ئەوەی شەڕەف و حەیای نەتەوەیەکی گەورە بپارێزێ. بەڵێ پێنج سەد ساڵ لەمەوبەر هەر رێک ئەم کاتە بوو، کە ئەو ئێرانییە جەنگاوەرە و ئەو پیاوە جوامێرە بە هەموو هێز و پێزی و بە بوون و نەبوونییەوە پێی نایە گۆڕەپانێک، کە پارێزەری ئێران بوو، پارێزەری ئازایەتی و غیرەت و بوونێک، کە سەرتاپای جەستەی دینداری ئەو بوو.

شا سمایلی سەفەوی، جوامێر و رەش‌سواری ئێرانی هاتە مەیدانی شەڕ بۆ ئەوەی نەهێڵێت فکر و هزری داگیرکەر و وێرانکەری بێگانە بێتە ناو خاکی ئێرانەوە. سەرەڕای ئەم سوپا بچووکە ئەوەندە جوامێرانە بەرەنگاری دوژمن بۆوە، کە بۆ هەمیشە ناوی کەوتە سەر مێژووی ئێران. دەسەڵاتی سەفەوی گەورەترین دەسەڵاتی ئێرانییە پاش ئیسلام، کە ئێرانی کڕییەوە. ئەو زنجیرە دەسەڵاتە هزری شیعەیان لە وڵاتی ئێران پەرە پێدا. هەندێ کەس ئیرادیان لێ گرتووە، بەڵام ئەمە بۆ خۆی دەستکەوت و سەرکەوتنێکی دیکە بوو لە مێژووی ئێراندا. چونکە لەگەڵ سەرهەڵدانی شیعە، ئێران خۆی لە عەرەب جیا کردەوە. جارێکیتر ئێران بوو بە زلهێزترین هێزی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و تەنانەت شیعە بوو بە لەمپەرێکی گەورە لەبەرامبەر هزری سوننەی عوسمانی. (پارسا دوست، ١٣٨٥).

## هەڵکەوتەی جوگرافیایی چاڵدێران

چاڵدێران ناوی شارەدێیەکی سەر بە سیاچەمەی (سیە چشمە) شارستانی ماکۆیە و لە باکوورە لەگەڵ شارەدێی قەلای دەرەسی و ئاواچیق و لە باشووریشەوە لەگەڵ شارەدێی سگمن ئاوا و ئەلەند هاوکەوشەنە. ڕۆژهەڵاتی لەگەڵ شارەدێی بەبەجێک لێک دەدرێ و ڕۆژئاواشی دەگاتە سەر سنوورەکانی نێوان ئێران و تورکیا. سروشتی وەرزەکانی لەبەر هەڵکەوتەی سروشتی و کوێستانیبوونی و هەروەها ئاووهەواکەی لەبەر زنجیرە کێوی سەر سنووری ئێران و تورکیا هەردەم لە گۆڕان دایە. ناوچە سنوورییەکانی سارد و کوێستانین و ناوچەکانی تریشی ئاووهەوایەکی مام ناوەندی هەیە. ئاوی خواردنەوەی ئەم شارەدێیە لە چۆماوەکانی قزڵچای و چاڵدێران و هەروەها لە بیر و کانیاو دابین دەکرێ. بەرهەمی هەرە زۆری دانەوێڵە و دەستی ماندووی جوتیار و مەڕدار لەسەر زگی تێر دەحەسێتەوە. پیشەی دەستی و چنینی ئەم شارە جاجم و گۆرەوییە. هەناردەی خەڵک بۆ شارەکانی دەوروبەر دانەوێڵە و خوری و شیرەمەنییە. و وردەوردە کە بەرەو سنوورکانی ئێران هەڵدەکشێی ناوبەناو خەڵک سەقاڵی پەروەردەی هەنگن. شارەدێی چاڵدێران ٨٤ گوندی گەورە و بچووکی بەسەرەوەیە. گوندە گرنگەکانی، سیەچشمە وەکو ناوەندی قەزاکە، شارەدێی قەرەبڵاغ، بابالو، سەعدەل، ئیمامقولیکەندی و خزرلی و زیوەن.

## پێوەندییەکانی دەرەوەی سەفەوییەکان

لە سەردەمی سەفەوییەکاندا، وەرزێکی نوێ لە مێژووی پێوەندییەکانی ئێران لەگەڵ وڵاتە گەورەکانی ئەورووپا بەتایبەت فەڕانسە کرایەوە. لەو سەردەمەدا، بارودۆخی سیاسیی-ئابووری بەتایبەت پاشایەتیی سەفەوی لەلایەکەوە و لەلایەکیتریش ئەو گۆڕانەی لە ڕۆژئاوا پێکهات بوو بە دوو هۆکار، کە حوکمەتە گەورەکانی ڕۆژئاوا وەکوو فەڕەنسا لە بەرامبەر دەسەڵاتە تازەپێگەیشتووەکەی ڕۆژهەڵات، واتە حوکمەتی سەفەوی بۆچوون

و لێکدانەوەی نوێیان بێت. بەم جۆرە لێکدانەوەیەش، هێشتا فەڕەنسەوییەکان لەبەر بارودۆخی ئەورووپا و گیرەوکێشەی تر، نەیانتوانی وەک رەقیبانی ئەسپانیایی و بەریتانیایی و هۆڵەندی پێوەندییەکی قایم و پتەو لەگەڵ ئێران بگرن و ببنە مۆرەیەکی چالاک لە بواری سیاسی و ئابووریی ئێراندا.

ساڵی ٩٨٨ک.ر. (سەرەتای سەدی شازدەی زایینی)، کە یەکەم حوکمەتی سەفەوی لەسەر دەستی شا سمایل و بەیارمەتیی قزڵباش دامەزرا، هێشتا بنەما و بنچینەی پێوەندییەکانی دەرەوە و سیستەمی دەسەڵاتدارییەتی وڵاتێکی سەربەخۆ بەتەواوی دانەڕژابوو. لە روانگەی زۆر لە توێژەران، ئەو سەدەیە-سەدەی شازدەیەم- وەکو سنووری نێوان سەردەمی نوێ و سەردەمی کۆنە. هەر لەو سەردەمەڕا، ئەورووپا خۆی ئامادە دەکرد بۆ داگیرکردنی وڵاتەکانی دیکەی گۆی زەوی. هەر ئەودەمی بناغەی سیستەمێکی نوێ بۆ نیزامی نێونەتەوەیی دادەڕژا. لەو سەردەمەدا، ئەوروپایەکی هاوپەیمان و یەککگرتوو لە گۆڕێدا نەبوو، بەڵکو هەندێک دەسەڵاتی پاشایەتی و عێلاتی شێوە شانشین و کۆمەڵە ناوچە و مەڵبەندێکیش بە شێوەی دەرەبەگایەتی هەبوون و ئیمپراتۆری عوسمانی لە ئەکتەرانی سەرەکی بوو لە نیزامی نێونەتەوەییدا، بەڵام لەبەر رەچاوکردنی سیاسەتی داگیرکاری و بەرینکردنەوەی دەسەڵاتەکەی بوو بە مەترسییەکی گەورە بۆ سەر ئەورووپای کریستییەن و یەک نەگرتوو. ئەم ئیمپراتۆرییە پاش داگیرکردنی یۆنان، دورگەکانی (ئیونی، بوسنی، ئالْبانی) و تەواوی ناوچەکانی باڵکانی گرت و لە بڕانەوەی سەدەی پازدەیەم رووی کردە بوداپەست و ڤیەن. بەهۆی ئەگەری یەکجاری زۆری لەناوچوونی دەسەڵاتی (رۆم) ترس و خۆف خستە ناو پاپەکانەوە و سەرانسەری سنوورەکانی رۆژئاوا کەوتنەبەر هەڕەشەی عوسمانی. لەم لاشەوە لەسەر سنوورەکانی رۆژهەڵاتی، هەندێک لە ناوچەکانی ئێرانی داگیر کردبوو و لەگەڵ روسیاش هەر ناوبەناو پێکدا هەڵدەپڕژان.

**سیستمەی نێودەوڵەتی لەم قۆناغەدا دەکەوێتە بەر کاریگەریی کۆمەڵە هۆکارێکی وەک:**

- پێشکەوتنی یەکجار کتوپڕ و خێرای تەکنەلۆژیا، ئاڵوگۆڕەکانی پیشەسازی وەکو دروستکرانی کەشتیی گەورەی چارۆکەداری تەیار بە تۆپی دوورهاوێژ، سەرهەڵدانی کەرتی بازرگانی و لە هەمووان گرنگتر سەرهەڵدان و تەقینەوەی هەستی پاوانخوازی و خۆدەوڵەمەندکردنی ئەوروپاییەکان و هەروەها کامڵبوونی دەسەڵاتی زلهێزانی داگیرکەری وەکو ئیسپانیا، پورتوگاڵ، بەریتانیا، فەڕەنسا، هۆڵەندا، بەلژیکا، ئیتاڵیا، رووسیا و ئەڵمانی-کە لەم دەسەڵاتە داگیرکەرانە تەنیا ژاپۆن و ئیمپراتۆری مینگ لە چین و مەغۆل ئاسیایی بوون- بوونە رۆڵگێڕی گۆڕەپانی نێو وڵاتان.

- مەترسییەکانی سەرچاوەگرتوو لە هەستی پاوانخوازی و داگیرکاری دەسەڵاتی عوسمانی بابەتێکی زۆر گرنگ و هاوبەشی نێوان دەسەڵاتی سەفەوی و زۆرتری دەسەڵاتدارانی ئەوروپا بوو، کە بوو بە هۆکاری نزیکبوونەوە و خۆڕێکخستن لەگەڵ ئێران و بەستنی گرێبەستی سەربازی و ئابووری دژی دوژمنی هاوبەشیان واتە عوسمانی.

- نەبوونی هاوسەنگی لە نێوان هێزی سەربازیی دوو وڵاتی عوسمانی و ئێران، کە ئەمەش دەگەڕاوە سەر دەستپێڕاگەیشتنی عوسمانی بە چەکە نوێیەکان (لەبەر هاوسنووربوونی لەگەڵ ئەوروپاوە) و حەول و تەقالای سوپای سەفەوی بۆ تەیار بوون بەم جۆرە چەکوچۆڵە.

- فەرمیبوونی ئایینی شیعە لە ئێران و مەترسی بڵاوبوونەوە و پەرەسەندنی لە دنیادا، بەتایبەت لە ئاسیای بچووک (تورکیای ئێستا).

- شکستهێنانی شێوەی دیپلۆماسی ئەوروپاییەکان، بارودۆخی کۆمەڵایەتی و دەسەڵاتی سیاسی، تێکەڵکردنی ناوەندی پارە دروستکردن (دراوخانە) و زێڕ لە سیستەمی دراوی ئێراندا، وەفدە دیپلۆماسییەکان، سیاسەتی دەستتێوەردانی پاپ و بەرەی هاوپەیمان دژی عوسمانی لەو بابەتانەن، کە لەو سەردەمدا زۆر جێگەی سەرنج و تێڕوانینن.

هاورێشم کالایەک بوو، کە گرنگترین سەرچاوەی خەزێنە بوو بۆ دەسەڵاتی ئێران لەلایەکەوە، راگوێزانی زۆرەملی سێ‌هەزار خێزانی ئەرمەنی لە جوڵفاوە بۆ ئیسفەهان (١٠٢١ک) هەناردەی وەبرەو خست و ئەوەش بۆ حوکمەتی ئێران قازانجی زۆری لێ کەوتەوە، بەپێی راپۆرتەکان ساڵانە بەرهەمهێنانی هاوڕیشم نزیکەی میلیۆنێک و ٦٧٣ هەزار پۆند بووە، کە لەو بەرهەمە ٣,١ داهاتەکەی وەکو باج دەخرایە خەزێنەی شاوە. سەردەمی سەفەوییە، سەردەمی پەرەپۆدەرکردن و وریشانەوەی کەرتی ئابووریی دراو و بازرگانی بوو. دروستکردنی پرد و کاروانسەرا لەسەر شاڕێگەکان، بناغەی ژێر بەنایەکی داڕشت، کە بۆ پەرەسەندن و گەشانەوەی کەرتی بازرگانی زۆر زەروور بوو. دامەزرانی پۆست و راهدارخانە لە شوێنی زۆر هەستیاری وڵاتی ئێران، سەرەڕای ئەوەی داهاتێکی زۆری وەکوو باج و خەراج دەخستە خەزێنەی دەسەڵاتەوە، لەو لاشەوە ئارامی و ئاسایشی کاروناچییە بازرگانە بیانییەکانی دابین دەکرد. سیاسەتی دەربار بۆ پاوان و قۆرغکردنی کەرتی بازرگانی هاوڕیشم لە سەردەمی شا عەباسی یەکەم، ئەگەرچی زیانی گەیاندە کەرتی بازرگانی و بازرگانە ئێرانییەکانی مایەپووچ کرد، بەڵام بۆ سامانی دەسەڵاتەکە خێری زۆری دایەوە.

لە سەردەمی سەفەوی، باڵوێز و وەفدی دیپلۆماتیک بۆ روسیا دەنێردران. دەسەڵاتدارانی رووسیاش بەدرێژایی دەسەڵاتی سەفەوی، باڵوێز و نوێنەر و قاسیدیان بە دیاری زۆرەوە دەنارده دەرباری ئێران. ئەوان هەم دەیانویست پێوەندی و هاتوچۆیان هەبێت و هەمیش بەدژی دەسەڵاتی عوسمانی بەرەیەکی هاوپەیمانیی سەربازی لەگەڵ ئێران پێک بێنن. ئەم پردە پەیوەندییانە، لەگەڵ مردنی شا عەباسی گەورە (١٠٣٨ک) چڕژی بەست و وردەوردە پێوەندییەکان بنەبڕ بوون و تا وایلێهات رووس ملی نا لە داگیرکردن و دەستدرێژی بۆ سەر خاکی ئێران. رووسەکان لە ئابی ١٧٢٣ زایینیدا بە نیازی داگیرکردنی ناوچە باکوورییەکانی ئێران، بەتایبەت ناوچەی کەناری دەریای خەزەر، ، کە پێگەیەکی سەربازی و بازرگانیی گرنگی هەبوو، گرێبەستێکیان لەگەڵ عوسمانییەکان لەسەر دابەشکردنی ناوچەکانی

ئێران، واژۆ کرد. دەستبەسەرداگرتنی کەنداوی فارس و داگیرکردنی دوورگەکانی کەنداویش بەدەست داگیرکەرانی ئەورووپاوە بابەتێکی تری سیاسەتی دەرەوەی سەفەوییەکانە. لەو ناوەدا حوکمەتەکانی پورتوغال و ئیسپانیا و بەریتانیا لەو داگیرکەرانە بوون. بە دوای ئەستاندنەوەی دوورگەی هۆرمز لە پورتوغالییەکان و چۆلکردنی بنکە بازرگانییەکان و دوورگەکانیتری کەنداو و دەرکردنی هێزە داگیرکەرەکانی ئیسپانیا و پورتوغال، ئامانجەکەی دیکەی سیاسەتی دەرەوەی سەفەوی هاتە دی. ئێران بەخۆی هەوڵی پەرەسەندن و گرژبوونەوەی ململانێیەکانی نێوان داگیرکەرانی بوو و توانی لەو ئاوە لێڵە ماسی بگرێ. بۆ وێنە دەکرێ ئاماژە بە تەشەنەسەندنی ململانێی نێوان بەریتانیا و سەرجەم داگیرکەرەکانی تر بکرێت لە ناوچەکانی کەنداوی فارس، کە دەرکردنی هێزەکانی بێگانەی لێ کەوتەوە.

## سووڕانی سیاسەتی دەرەوەی ئێران بەرەو وڵاتانی ئەورووپایی

لە سەرەتای دەسەڵاتی سەفەوییە سیاسەتی دەرەوەی ئێران زۆرتر لەسەر وڵاتانی دراوسێ بۆ وێنە عوسمانی سووڕی دەخوارد، کە شا سمایل خۆی حەزی لەوجۆرە سیاسەتە بوو و کەمتر هۆگری رێکخستنی پێوەندی بوو لەگەڵ وڵاتانی ئەورووپایی، بەڵام هەڵوێستی نەیارانە و دوژمنخوازانەی سوڵتانە عوسمانییەکان سیاسەتی دەرەوەی ئێرانی گۆڕی و دەسەڵاتی هێنایە سەر ئەوەی، کە روو بکاتە وڵاتانی ئەورووپایی و پێوەندییە دیپلۆماسییەکانی لەگەڵ دەسەڵاتانی ئەورووپا بەرین بکاتەوە، دیپلۆماسی ئێران لەو سەردەمەدا زۆرتر بە تەمابوو، کە دەسەڵاتانی ئەورووپایی بەرەو خۆی رابکێشێت بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی هاوپەیمانی سەربازی دژی تورکە عوسمانییەکان و هەروەها بۆ گرێبەستە بازرگانییەکان.

لە سەردەمی سەفەوی، وڵاتانی ئەورووپا زۆریان سەرنج دەدا بە وڵاتی ئێران. ڤێنیزی و پورتوغالی و ئیسپانیاییەکان لەو دەسەڵاتانە بوون، کە

روویان لە ئێران بوو، بەڵام دواتر ئەوانە لە ناوچوون و سێ هێزی هۆڵەند و بەریتانیا و فەڕەنسا جێی پڕکردنەوە. هەڵبەت دواتر هۆڵەندییەکانیش هەر لەو ململانێیەدا کلابوون و رووسەکان-ئەویش پاش شەڕەکانی ئێران و رووس لە سەردەمی قاجاریە- پێیان نایە ئێرانەوە. کلیلی بازرگانی دەرەوەی ئێران تەنگەلانی هۆرمۆز بوو، کە سەرەتا لەبەر دەستی پورتوغالدا بوو و دواتر ئێرانییەکان بەیارمەتی بەریتانیا داگیریان کرد.

بەرینبوونەوەی دەسەڵاتی ئێران و پەرەسەندنی سنوورەکانی لە سەردەمی هەندێ لە پاشاکانیدا بۆ وێنە سەردەمی شا عەباس و نادر شای ئەفشاردا و گەیشتنەوەیان بە سنوورەکانی سەردەمی ساسانییەکان، بۆ ئێران دەستکەوتێکی مەزن بوو و ئێرانی لەسەر ئاستی نێونەتەوەیی زەق دەکردەوە. ئەوەش بۆ ئەورووپا، کە بەڕاستی لە ترسی هەڕەشەکانی عوسمانی خەوی لێ نەدەکەوت، دەسکەوتێکی گەورە بوو. بەجۆرێک، کە دەسەڵاتداران و دەوڵەمەندانی ناو حوکمەت، دەوڵەتی سەفەوییان بە رزگاریدەری خۆیان دەزانی. هەر بۆیە هەردەم پەیامی خۆش و هیوابەخشیان دەنارده ئێران و پاشاکانی ئێرانیان هان دەدا بۆ بەردەوامبوونی شەڕ لە دژی عوسمانی.

پاش ئەوەی سەرماوسۆڵ و بەفروبۆران و لەبنبڕانی ئازوقە تەنگی بە هێزی سوڵتان سەلیم هەڵچنی و هێز و توانای لێ بڕی و لە ئازەربایجان پاشەکشێی کرد، نێردراوی ڤێنیز لە دەرباری عوسمانی نامەیەکی بۆ پاشاکەی خۆی دەنێرێت و تێیدا دەنووسێت: (تا ئەو جێیەی من عەقڵم پێی بشکی ئەو بەسەرهاتەی بەسەر سوڵتان هاتووە هەر بە ویستی خودا بووە و بەس، چونکە دەیەوێت دنیای کریستیانییەکان بپارێزێت. (وەرگیراو لە وتەکانی ترویزیانو، باڵوێزی حوکمەتی ڤێنیزیا لە ناو دەرەباری عوسمانی).

# شا سمایل و شەڕی مێژووییەکەی چاڵدێران

شا سمایل دامەزرێنەری زنجیرە دەسەڵاتی بەهێز و نیشتمانپەروەری سەفەوی لە مەیدانی شەڕە شمشێر و لە کۆڕی بەزمدا هەوری بەهاران بوو. هێندە شایان و شایستە بوو، هێندە بەخشندە و دڵاوا، بەروحم، فەقیر و دەوڵەمەند و گەورە و بچووک لای یەکسان بوو. تا بڵێی دڵاوا. یەکجار حەزی لە راو بوو. لاهیجان، کەسایەتیی شا سمایلی کامڵ کرد و کەسایەتییەکی مەزهەبی-سیاسیی لێ دروست کرد، ئەو هەر لەوێ کەوتە بەر فێربوون و زانین. دوکتۆر پارسا دوست رای وایە کە: (لاهیجان بوو بە لانکەی پەروەردە و گەشەی فکری سمایل، کە دەگەڕێتەوە بۆساڵی ٩٠٠ک. م. ئەو کەسانەی لە دەوروبەری بوون، هاوڕێ و مامۆستاکانی بۆ پێگەیاندنی بیروبۆچوونە مەزهەبی و سیاسییەکانی رۆڵێکی بەرچاویان بووە. شا سمایل لە ژیانیدا رۆژێک نەحەساوە. زنجیرە دەسەڵاتی سەفەوی هەمیشە دەینداری ئەو و پێڕەوانی و موریدانی وەفادارییەتی.

ساڵی ٩٠٧ ک.م هەر، کە دەسەڵاتی کەوتە دەست، یەکەم هەنگاوی فەرمیکردنی ئایینی شیعە بوو. هاوکات لە وڵاتی دراوسێ واتە عوسمانی، سوڵتان بایەزید حوکماتی دەکرد. سوڵتان بایەزید موسوڵمانێکی سوننە بوو کەسێکی ئارام و لەسەرەخۆ و شەڕنەفرۆش و ئاشتیخواز. هەردەم لە شەڕی موسوڵمان خۆی دەبوارد. سەلیم، کوڕی بایەزید بە پێچەوانەی باوکی، پاوانخواز و دەسەڵاتخۆشەویست بوو و حەزی لە سیاسەتی باوکی هەر نەبوو. ساڵی ٩١٨ک.م/١٥١٣ز لە ٢٢ ساڵیدا، پاش ئەوەی بە قەوەی سەرکردەکانی سوپا، دو برا گەورەکەی لە کۆڵ خۆی کردەوە. باوکیشی لە شوێنی دەسەڵاتی دوورخستە و ئەوجار بە ئەرخەیانی و ئاسوودەیی لەسەر کورسیی دەسەڵات پاڵی داوە. ناسراو بوو بە (یاوز) واتە بێبەزە. هەردەم هەوای ئیمپراتۆرییەکی گەورەی لەسەردابوو، کە باڵی وەسەر جیهان کێشابێت. هەر بۆیە هەمیشە لە بیانویەک دەگەڕا و پەڵپی بە دراوسێی دەگرت و سەرەنجام سوپای وەسەر دەکرد. بۆ هێرشکردنەکەی ئێران

دەستەوداوێنی فتوای پێشەواکانی خۆی مایەوە. فتوای قەڵتوبڕی شیعە هەر لەسەر دەستی سەلیم و هەر بە هەڕەشەی سەلیم دەرچوو.

شای سەفەوی، کە پێی وابوو ئیمپراتۆری عوسمانی هێرشی ناکاتە سەری، ڕێگەی کوردستانی گرتەبەر لە هەمەدان هەواڵی پێگەیشت، کە سەلیم بەرەو ئێران بەڕێوەیە. هەر دەستبەجی بۆ کۆکردنەوە و تەیارکردنی سوپا بەرەو تەورێز ئەسپی تاو دا. لە تەورێز بیست هەزار کەسی وەسەر یەک نا و لە دەشتی چاڵدێران ڕێگەی لە دوژمن بڕی.

بەڵام سوڵتان سەلیم بە تۆپەوە هاتبوو، سوپاکەی بە ئەزموون و کارکوشتە بوون وای لە خەیاڵ دابوو، کە هەر بە ئاسان و بی گرێ و گۆڵ سوپای ئێران دەبەزێنێ و ئەو کاتیش بەرەو پایتەخت پێشڕەوی دەکات، بەڵام خەیاڵ بەس ئارەزوویەکی کۆنە. لەگەڵ دەستپێکردنی شەڕ هەر لە بەرەبەیانی چوارشەممەی دووەم ڕۆژی ڕەجەبە مانگی ٩٢٠ک.م، ٢٣ ئوتی ١٥١٤ز بەرخودان بیوێنە لە سوپای ئێران تۆمار کرا. ئەگەرچی سوپای ئێران بەرەو ئێوارە ناچار پاشەکشێی کرد، بەڵام (سوڵتان سەلیم سەری سوڕمابوو لە ئازایەتیی ئێرانییەکان تەنانەت تا ئەوکاتیش باوەڕی بە پاشەکشێی قزڵباشان نەکرد و پێیی وابوو فێڵە و شای ئێران بە تەمای تاکتیکە).

هۆکارێکی پێشڕەویی خێرای عوسمانییەکان لە بەرەی ئەورووپا، بێدەسەڵاتی حوکمەتەکانی ڕۆژهەڵات بوو، بەڵام لە ساڵی ١٥٠٠دا دوای چەندین سەدە بۆ یەکەمجار لە ئێراندا دەسەڵاتێکی ئێرانی هاتە سەرکار، لەدایکبوونی ئەو دەسەڵاتە، کە پاشان ناوی خۆی نا سەفەوی، بوو بە هۆکاری هێوربوونەوەی پێشڕەوییەکانی عوسمانی بەرەو ڕۆژئاوا. نۆبەرەی ئەم دەسەڵاتە بە شا سمایلەوە دەستی پێکرد، پیاوێکی ئازا و شەڕکەر و جوامێر و هەر لە بنەچەکەشیەوە شیعە بوو. ئەو سەرەتا گێلان و تەورێز و هەمەدانی گرت پاش ئەوەی حەوت عەشیرەتی تورک سوێندیان بۆ خوارد و ڕەگەڵ خۆی خستن. پەلاماری ڕۆژئاوای ئێرانیدا (کوردستان- وە) و

لەولاشەوە لەگەڵ ئەوەی ئۆزبەکەکانی تێکشکاند ڕۆژهەڵاتی ئێران و خۆراسانیشی خستە ژێر دەسەڵاتی.

بەهێزبوونی حوکمەتی ئێران و نزیکبوونەوەی ئەو مەترسییە لە بەغدا، خەمی خستە دڵی دەسەڵاتی عوسمانییەوە. لە وڵاتی عوسمانییەکان سوڵتانێکی تا بڵێی بێبەزە و بێبەزە ناسراو بە یاوز حوکماتی دەکرد.

هەندێک لە مێژوونووسان بۆ وێنە سایکسێن چوار سوڵتانی گەورەکەی عوسمانی ناو دەبات: (سوڵتان موراد، سوڵتان محەمەدی فاتیح، سوڵتان سلێمان و سوڵتان سەلیم).

ناردنی باڵوێزی ئێران بۆ مەمالیکی میسر و مەجارستان لە ١٥١٤دا سوڵتان سەلیمی بۆ لەناوبردنی سەفەوییەکان وەپەلەپەل خست.

کوشتنی ٤٠ هەزار شیعەی ئاسیای بچووک (ئاناتۆلیا) و ناردنی نامەی پڕ لە هەڕەشە و گوڕەشە، شەڕی هێنایە بەر دەرکی شا سمایل. ١٢٠ هەزار سەربازی تورکی هەبوو و، ترسیشی دەخستە دڵی دوژمنەوە. مێژوو خۆی شایەتە لە سەدەی ١٥ و ١٦ و ١٧ی زایینی تورک هەردەم سوپایەکی مەزنی وەسەر نەیارانی کردووە. لەوکاتەدا شا سمایل هێزێکی ناردبووە یارمەتیی بابری حاکمی هیند، هەربۆیە نەیدەتوانی سوپایەکی ئاوا مەزن وەسەر یەک بنێ، بەڵام پێی نابەحەق و خوێڕیانە بوو، کە دوژمن هەروا بە ئاسوودەیی و بێخەم وڵات تاڵان بکا. هەربۆیە سەرەڕای ئەوەی هەواڵیان پێدابوو، کە سوڵتان سەلیم بە ١٢٠ هەزار شەڕکەری یەنیچریی بەئەزموون و خاوەننەزم و سوارکار و تفەنگ بەدەست، بە تۆپەوە وەڕێ کەوتووە، ئۆقرەی نەگرت و لە نزیک ورمێ لە دەشتی چاڵدێران خۆی گەیاندە سوپای دوژمن. لە حاڵێکدا مێژوونووسەکان دەڵێن هێزی شا سمایل تەنیا ٣٥ تا ٦٠ هەزار کەسێک بوو. عوسمانییەکان هەر لە سەرەتای شەڕەوە تێگەیشتن، کە سواری ئێرانی بەکار و بەزەبرە و دەبێ بە زەبری تۆپخانە چارەنووسی شەڕ بگۆڕدرێ. هەربۆیە تۆپەکانی یەنیچری لە پشت سوپای پیادە و سواری عوسمانی دابەسران و ئەو تۆپانە وەکوو پشتیوانیەکی ستراتیژییک بوون.

شا سمایل سوپاکەی کردە دوو بەش بەشێکی خستە بەردەستی سەرۆک عەشیرەتی ئیستاجلو، کە لە عەشیرەتە ئازاکانی تورک بوون و نیوەی تریش، خۆی بوو بە سەرکردەیان. شا سمایل خۆیشی دەیزانی تورک، پشتی بە تۆپەوە گەرمە. هەربۆیە وای بە باش زانی، کە کوتوپڕ و خێرا و گورجانە پەلاماری دوژمن بدات. وێکڕا ٣٥ هەزار سوار لە هەر چوارلاوە پەلاماری دوژمنیان دا.

هێرشی شا سمایل هێندە کوتوپڕ بوو، کە شەپۆلی پیادە و سواری تورکان دەروەستی نەهاتن و شا خۆی گەیاندە تۆپخانە، بەڵام لەولاوە، سوارانی ئیستاجلو ڕێک کەوتنە بەر ئاگری تۆپخانە و زۆریان لە خوێن گەوزان و تەنانەت سەرکردەکەشیان. لە بەرەی راستی سپای ئێران، شای ئێران و سوارەکانی لە ناوەندی گۆڕەپانەکە —لەبەر هەڵمەتی ئێرانییەکان تۆپخانەی تورک دەستەوەستان مابۆوە- زۆر ئازایانە تورکیان تێک دەشکاندن، بەڵام لە پڕدا سوڵتان سەلیم هێزی ئاگرپژێنی یەنیچرییەکانی هێنایە شەڕەوە. ڕەش‌سواری ئێران بۆ ئەوەی خۆی لەو ئاگرە دەرباز بکا، بێباکانە و سینگی وەبەر گوللەی یەنیچری نابوو و پێی وابوو هەڵمەتی کوتوپڕیان دیسان ریزی یەنیچری لێک هەڵدەبڕی، بەڵام داخی گرانم ئەو سەربازە سوورپۆشانە هەر وەک مرۆی جۆلاتەنە لە جێی خۆیان بەئاستەم دەبزوان و هەر ڕێژنەی گوللە بوو رووی لە سوپای ئێران دەکرد. شەڕ هەر دەهات و گەرمتر دەبوو. جۆگەلەی خوێن بە نێو تەرمی سەربازاندا ریزیان دەبەست و شوێن شوێن گومیلکەی خوێن پەنگی دەخواردەوە، تەرمی تورک و فارس کەوتبوونە سەر یەک. سوارکاری ئێرانی گەمارۆ درابوون. لەپڕدا سەربازێکی یەنیچری شمشێرێکی لە بەرۆکی ئەسپەکەی شا سمایل دا و هەڵیدڕی و زەبری دووەم لاقی شای ئەنگاوت و شا زامدار کرا. پیاوانی قزڵباش، کە بە هیچ کلوجێک بەتەما نەبوون دەوری شایەکەیان چۆڵ بکەن شایان سواری ئەسپێکی ساغ کردەوە و بەنێو یەنیچری دڕ و لاوردا دەربازیان کرد، خێرایی عەشیرەتی قزڵباش و ماندوویەتی جەنگاوەرانی

عوسمانی لەو ساتە وەختەدا بۆشایی و کەلەبەرێکی کردەوە و سواری ئێرانی مەیدانی شەڕیان بەجێ هێشت.

ئۆردوی ئێران بە تالان چوو. تەورێز کەوتە بەردەستی تورکان، بەڵام خۆ داگیرکارییەکانی تورکی عوسمانی هەر بە کوردستان و دیاربەکر نەبڕایەوە. ئاکامی شەڕەکە رەگ و ریشەی هەستی تۆڵەی قایمتر دەکرد و لە کۆتاییدا دروستبوونی دەسەڵاتێکی بەهێزی لە بەرەی رۆژهەڵاتی ئیمپراتۆری عوسمانی لێ کەوتەوە. عوسمانییەکان ئەودەمی لەوپەڕی هێزی خۆیاندا بوو. دوو ساڵی پێنەچوو میسریشیان گرت. دەوروبەری رۆژهەڵات و باکووری ئەفریقا هیچ دەسەڵاتێکی گەورە و بچووک گیانی ساڵمی بەدەر نەبرد، بەڵام دەمارگرژیی سەربازە ئێرانییەکان پەیامێکی دەناردە دەرباری عوسمانییەوە، کە لەو بەشەی سنوورەکانیان دەبێ چاوەڕوانی شەڕی گەورەتر بن. شەڕی چاڵدێران بوو بە دەسپێکی زنجیرە شەڕی ئێران و عوسمانی، کە چوارسەدساڵ هەر نەبڕایەوە. سەرەنجام دوای ٤ سەدە، کە هەردووک دەسەڵات بڕستیان لێ بڕا، هیچ کامیان نەیانتوانی لەم ململانێیە سەرکەون و یەکیان لە مەیدانی ژین کلا بێ، بەڵام هەر ئەوەندەی، کە ئێرانییەکان سەربەخۆیی خۆیان پاراست و لە بەرامبەر دەسەڵاتێک، کە دەیان حوکمەتی بە چۆکدا هێنابوو، رووسوورانە سەربەخۆیی خۆیان پاراست خۆی لە خۆیدا خاڵێکی زۆر ئومێدبەخش بوو. حوکمەتە ساواکەی سەفەوی لە سەردەمی شا سمایل و تەهماسوب نەیتوانی بەسەر سوپای مەزنی عوسمانیدا زاڵ بێت، بەڵام بەرخۆدان و بەرەنگاری ئەوان بوو بە بەردی بناغەی سەرکەوتنەکانی سەدەی ١٧.

## سنوورەکانی ئێران لە سەردەمی شا سمایلدا

شا سمایل بۆ سەربەرزکردنەوەی ئێران و ئەستاندنەوەی ناوچە داگیرکراوەکانی تاکو دوایین دلۆپی خوێن هەر شەڕی کرد.

سەرەتای دەسەڵاتی لە کۆماری ئازەربایجان، باکۆی گرت. ئەو کات لە ساڵی ٩١٤ وە فریای عێراقی عەجەم کەوت، کە هۆز و عەشیرەتە عەرەبەکان کردبوویانە مەیدانی رمبازێن و جلیتانێی خۆیان و دیسان ئەو ناوچەیە وەسەر هەرێمی ئێران خستەوە. دواتر بەرپەرچی پەلامارەکانی ئۆزبەکی داگیرکەری دا و شکستی دان. ئینجا مەر و هەرات و بەڵخی-کە هەنووکە کەوتوونەتە ناو وڵاتانی ئەفغانستان و تورکمەنستان و ئۆزبەکستان- بە وڵاتی ئێرانەوەی لکاند ساڵی ٩٢٠ پاش داگیرکارییەکانی سوڵتان سەلیم لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی سەفەوی، بۆ شەڕی تۆڵە و ئەستاندنەوەی وڵات بەرەو سنوورەکان خۆشی. چاڵدێران لە مێژووی ئێراندا زۆر گرنگە وەک باسمان لێوە کرد. لە لایەکەوە شا سمایل داوای لە هەموو هۆز و نەتەوە ئێرانییەکانی وەکو، گێلانی، کورد، لوڕ، بەختیاری، ئازەری، بەلوچ و خوزییەکان و.. کود و پاش هەزارساڵان ئێرانێکی یەکپارچە و یەکگرتووی پێک هێنا و لەلایەکیتریشەوە ئێرانییەکان لە چاڵدێران کەسیان بە دیل نەگیرا(؟) و تاکو دوایین پشووی ژیانیان خۆڕاگرییان کرد و خۆیان بە کوشتدا. بەڕاستی ئێرانییەکان چیرۆکێکیان نووسی، کە تاکو ناوی ئێران بمێنێتەوە باسی شەڕی چاڵدێران هەر لە یاداندا زیندووە.

سوڵتان سەلیم پاش سەرکەوتنی لە شەڕی چاڵدێران بەرەو تەورێز ئەسپی ئاژواند و لە چوارەمی سیپتامبەری هەمان ساڵ گەیشتە ناو تەورێز، بەڵام لەگەڵ نارەزایەتی و بەربەرەکانێی ئێرانییەکان رووبەڕوو بۆوە و جارجاریش بە شەڕ و نیوە شەڕ خۆیان دەرباز دەکرد، کە هێزە وەفادارەکانی سەر بە شا سمایل بوون جێگەیان بە سەلیم لێژ کرد و ناچار سەلیم پاشەکشێی کرد و گەڕایەوە.

تا کاتی شەڕی چاڵدێران، شا سمایل هاوڕا و هاودەنگ نەبوو بۆ بەکارهێنانی چەکی قورس و ناورپژێن، بەلایەوە وەکو چەکێکی کۆمەڵکوژ سەبری دەکرا و و بە چەکی مرۆی خوێڕی و حیز دەیناسی. سەرەڕای ئەمەش هێزی سوپاکەی زۆرتریان قزڵباش بوون و هێزێکی تۆکمە و

ڕێکوپێک، کە لە نەتەوەکانی ئێران پێکهاتبی لەبەر دەستی شا سمایلدا نەبوو، شەڕی چاڵدێران بە درێژایی مێژوو، مەزنترین شەڕی شمشێر بوو لەگەڵ تفەنگ. هەر ئەزموونی ئەم شەڕە بوو، یەکیەتی سۆڤیەتی هێنایە سەر ئەوە، کە ساڵی ١٩٤٩ ببیتە خاوەنی بۆمبی ئەتۆمی و ١٩٥٣ بۆمبی هایدرۆژنی وەگیر خات و ١٩٥٧ مووشەکی دوورهاوێژی هەبێت و سەرجەم وڵاتانێک، کە ئەو چەکانەیان نییە لە هەوڵی بەدەستهێنان و دروستکردنیدا بن. چونکە نەتەوە یەکگرتووەکان ئەو جۆرەی، کە دەبوو لە دەستی بێت پێدەچێ کەس کای بە کڵاوی نەپێوێ و نەتوانن ببنە هۆکارێک بۆ بڕینەوەی کۆمەڵکوژی و شەڕ و ببنە داشداری وڵاتانی بچووکی بێ‌هێز و لێقەوماو.

مخابن گرنگترین ناوچەکانی کوردنشینی ئێران کەوتە بەردەستی عوسمانییەکان و داگیریان کرد و بۆ هەمیشە لە وڵاتی ئێران دابڕان و نەدرانەوە بە ئێران. ئێستا نیشتمانی نزیکەی ٢٠ ملیۆن کوردی ئێرانی ڕەگەز(؟) بەسەر وڵاتی تورکیاوەیە، کە گشتی ئەم نیشتمانە ڕۆژانێک سەر بە وڵاتی ئێران بوو. شا سمایل پەلی دەسەڵاتی هاویشتە گورجستان و ئەو وڵاتە بە ڕەشەڵەک ئێرانییەیشی وەسەر دەسەڵاتەکەی خست. ساڵی ٩٢٩ جارێکیتر گورجستان بۆوە بە بەشێک لە وڵاتی ئێران. ئەو گشت دەسەڵاتە میرنشینییەکان و دەسەڵاتانی خۆجێیی ناو ئێرانی وەسەر یەک خستەوە و دیسان پێکی هێنان و داگیرکەرانی ڕاو نا و ئێرانێکی تۆکمە و یەکپارچە و یەکگرتووی لە مێژووی ئێراندا بنیات نا.

لە سەردەمی دەسەڵاتدارییەتیی شا سمایلدا، دوژمن بە زەبری شمشێر دەکشاوە، نەک بە زەبری قەڵەم و کتێب، چونکە هەردەم پەلاماری لایەکی ئێرانیان دەدا. بەپێی وتەی ئەحسەنولتواریخ، ئازەربایجان، عێراقی عەجەم، خۆراسان، فارس، کرمان، خوزستان و بلوچستان و... کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی ئێران و ناوچەکانی دیاربەکر و بەلخ و مەرویش هەر کەوتنە بەر دەستی دەسەڵاتدارییەتیی سەفەوی.

# شا سمایلی سەرکەوتوو و پاراستنی سنوورەکان

دوو کێشەی گەورە، کە بەرۆکی شا سمایلی گرتبوو ئۆزبەک و عوسمانی بوون.

دامەزرێنەری زنجیرە دەسەڵاتی ئۆزبەکان شیبەک خان بوو، کە هاوکات بوو لەگەڵ سەردەمی سەفەوی. ئەو توانی بابر شکست بدات و بۆ هەمیشە بنەچەکی تەیمووری لەسەر کورسیی دەسەڵات کلا بکات. ماوەرائولنەهر و خۆراسان کەوتە بەردەستی ئۆزبەک و بەم دەستکەوتەیان بوونە دراوسێی دەسەڵاتی سەفەوی. ئۆزبەک چاوی بڕیبووە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی سەفەوی و لەم لاشەوە شا سمایل هەوای داگیرکردنی خۆراسانی لەسەردا بوو، لە روانگەی ئاینییەوە هەر قەڵسەیەیان لە یەکتر دەگیرا و گەڕیان بەیەکتر دەکرد. هەردووکیان وشکەڕۆ و توندمیزاج بوون و هەردووکیشیان هەوای بەرینکردنەوەی دەسەڵاتیان لەسەردا بوو. زۆر نامە و قسەیان لە نێوانیاندا هات و چوو.

لە نامەیەکیدا شیبەک خان هەڕەشە لە شا سمایل دەکات و بۆ جاڕدانەکەی ئایینی شیعە سەرکۆنەی دەکات و داوای لێ دەکاتن ئەگەر دەستبەرداری ئەو ئایینەی نەبێت ئەوا هێرش دەکاتە سەر ئێران و خاکی ئەسفەهان بە تورەکە دەبات.

خولیای داگیرکردنی وڵاتانی ژێر دەسەڵاتی سەفەوی بەدەستی شیبەک خانەوە، هۆکاری خۆی هەبوو. هیچ، کە هەوای بەرینکردنەوەی دەسەڵاتی لەسەردا بوو، لەگەڵ سیاسەتە ئایینییەکانی شا سمایلیش نەدەسازا، چونکە شیبەک خان سەرەڕای ئەوەی، کە ئایینی شیعەی وەکو لادان لە ئیسلام و چەواشەکردنی ئیسلام دەزانی، ئەو هەر حەزی لەوەش نەبوو، کە دەسەڵاتێکی شیعە لە ئێران رەگ داکوتێ و بنیات نرێ. ئۆزبەک زنجیرە

هێرشێکیان کردووەتە سەر وڵاتی ئێران و لە تاڵانوبڕۆ و قەڵتوبڕی خەڵکی سڵیان نەدەکرد.

لە سەرەتاوە شا سمایل بۆ شەڕی ئۆزبەکان هەر خۆی دەبوارد، بەڵام چاری نەبوو لە کۆتاییدا بڕیاری دا، کە بەرپەرچی پەلامارەکانیان بدات و بەرەو خۆراسان وەڕێکەوت و... شەڕی مەرو بوو بە شەڕی مان و نەمان. شیبەک خان بە سەهوو چوو و فریوی تەکتیکی پاشەکشێی شا سمایلی خوارد و زەبرێکی گورچووبڕی پێکەوت و لە بن هات و گیانیشی تێدا چوو.

شا سمایل زۆر ئازایانە لەو شەڕەدا گورزی وەشاند. تەرمی شیبەک خانیان هێنایە بەردەستی، میر مەحمود خاندەمیر لەو بارەیەوە بەم جۆرە دەنووسی: (دەستبەجی سەریان بڕی و لەبەر دەستی شا سەربەرزیان دانا، ئەو پایەبەرزە پاش ئەوەی سەری بێ گیانی دیتن، داوای لەشی پڕ لە قینی شیبەکی کردن. شمشێر بەدەستی پیاو کوژان دەستاوبەجی تەرمی شیبەکیان بۆ هێنا. قارەمانی گورزوەشێن و شێری دوژمنبەزێن هەڵیکێشایە شمشێر و سێ زەبری شمشێری لە تەرکی زگی دا و گازی کردنە قۆرچی و مەیتەر و نۆکەران. هەرکەسانێک سڵامەتیی سەری شایان دەوێت، لە گۆشتی دوژمنی من، با بچێژێت. شایەتی راستگۆ و بی دەغەڵ و بێ درۆ دەگێڕنەوە لەسەر گۆشتی ئەو کەلاکە ناپاکە و ئەو دوژمنە داخلەدڵە بوو بە هەڵا و عالەم هروژمیان هێنا چەند کەسێکیش بریندار بوون و (ئەو کەسانەی لە دوورەوە و دەستیان نەیگەشتبوو، پارەیەکی زۆریان دەدا بە جینچکێک گۆشتی شیبەک) و گۆشتی نەکوڵیو و خوێناوی (حەرام و قوڕاوی) هێند تامەزرۆیانە دەیانفڕاند و قوتیان دەدا، کە چاوچنۆک و خوێڕی و سپڵەی برسی لە وەختی بەشینەوی گۆشتی چڵکاوخۆریی هێندە تامەزرۆیانە هەڕاناکەنە سەر گۆشتی سەر چەپەری. دواتر شای شیعە مەزەب فەرمووی، کە کاسەی سەری شیبەک لە زێڕاو بگرن و بە چەشنی جامی شەڕا هەڵیکۆڵن و تا بەرەبەیان شەویان کوتا. ئەوجار شا فەرمووی پێستی سەری شیبەکم بە کا بناخننەوە و بەدیاری بینێرنە دەرباری سوڵتانی عوسمانی).

کێشەی دیکەی شا سمایل عوسمانییەکان بوون زستانی ٩١٩ک.م سوڵتان سەلیم بە یەکجاری بڕیاری شەڕی دا. ئەو سەرەتا فەرمانیدا بە حاکمی ئەرزەنجان، کە دانیشتوانی شیعە مەزهەبی ئەرزەنجان بە ماڵ و منداڵەوە بنێرێتەوە وڵاتی ئێران و دواتر هاتە سەر ئەوەی شیعەکانی ئاناتۆڵیا بنەبڕ بکات، کە بە پێچەوانەی خواستی سەلیم لە دینی سوننە لایان دابوو. هەر بەو جۆرە نزیکە ٤٠ هەزار کەس گیانیان دەرچوو... و ئەوجار بە سوپایەکی مەزن و تەیار رووی کردە وڵاتی ئێران.

شەڕی چاڵدێران شەڕی سەرکەوتن و داگیرکردن نەبوو، وانەیەکی مێژوویی بوو بۆ دەسەڵاتدارییەتی لە ئێراندا. هەر بە وتەی مێژوونووس و توێژەران، سوپای ئێران و شا سمایل بەوپەڕی ئازایەتی و بوێرییەوە، بەرەنگاری دوژمن بوونەوە، بەڵام سەرەنجام عوسمانییەکان سەرکەوتن. دوکتۆر پارسا دوست لە کتێبی توێژینەوەکەی خۆی باس هۆکارەکانی شکستهێنانی شا سمایلی کردووە و هەروەها دەرەنجامەکانی شەڕی چاڵدێرانیش دەخاتە بەر چاو. لە روانگەی پارسا دوستەوە ئەو هۆکارانە لە شکستی چاڵدێران کاریگەر بوون: رۆڵی تۆپخانە، سەرنج نەدان بە گرنگ بوونی پێشبینی بارودۆخەکە، ئایینی تاکە کەسی خودی شا سمایل، لاواز بوونی سیاسەتی دەرەوە، گوێنەدان بە ریالیزم بوون، سەرنج نەدان بۆ کۆکردنەوە و وەگیرخستنی هەواڵ و زانیاری، هەڵە بۆ هەڵبژاردنی مەیدانی شەڕ، سەرنج نەدان بە کاتی هەڵمەت بردن، نەبوونی تاکتیکی شیاو و بەجی، گرنگی‌نەدان بە ئاست و پلەی فەرماندەی هێز. پارسا دوست دەرەنجامەکانی شەڕیشی لێک داوەتەوە، کە لێرەدا ئاماژە بە هەندێک لەمانە دەکەین: روون بوونەوەی رۆڵی تۆپخانە، بوونی سوڵتان سەلیم لە تەورێز، گۆڕان بەسەر باری رۆحی و دەروونی شا سمایلدا، بێباوەڕبوونی قزڵباشەکان و سەرهەڵدانی تووڕەیی و ناڕەزایی جەماوەر، کەمبوونەوە و هێوربوونەوەی توندوتیژییە ئایینییەکان، پێکهێنانی هاوپەیمانی لەگەڵ ئەوروپا.

## دەرەنجامەکانی شەڕی چاڵدێران و کاریگەرییەکانی لەسەر بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات

جیابوونەوە و دابڕانی ناوچەکانی دیاربەکر، مەرعەش و ئەلبستان لە ئێران، کە ئاسەواری شکستی عەلائولدەولەی زولقەدر بوو لە شەڕی سەنان پاشا و کوژرانی عەلا و بڕانەوەی زنجیرەی دەسەڵاتی زولقەدر لە مەرعەش و ئەلبستان داگیرکردنی ئەو ناوچانەی لێ کەوتەوە.

شکانی شا سمایل لەو شەڕەدا بوو بەهۆی گۆڕانی رەفتار و هەڵسووکەوتی شا بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری دەسەڵات و حوکمەت و گۆڕان لە پێوەندییەکانی شا لەگەڵ میرانی قزڵباش و هەروەها گۆڕانکاری لە پێوەندییەکانی کاربەدەستانی حوکمی هەردووک دەسەڵات... شەڕی چاڵدێران ئیرادەی شا سمایلی تێک شکاند، ئیرادەیەک، کە هەردەم خۆی بە نەبەزی ناو مەیدانەکانی شەڕ ناو دەبرد. ( ساڵی ٩٠٥ک. م. را تا ٩٢٠ک.م. بە درێژایی پازدە ساڵان شا سمایل هەرچەندیش سوپایەکی کەم و بچووکی بەدەستەوە بووبێت، بەڵام هەمیشە بەسەر دوژمندا زاڵ بووە و دوژمنی تێک شکاندووە) و ئەو شەڕە کاری کردە سەر رەفتار و هەڵسووکەوتی شا سمایل. خۆپەرستی و خۆبەزلزانی و لووتبەرزیی شا سمایلی تواندەوە و پاش ئەم شەڕە خەم و خەفەت و خەمۆکی بەرۆکی گرت و بەرگکی رەش و عابای رەش و مەندیلی رەش و ئاڵای رەش بوونە دروشمی شا سمایل، جێگە و پێگەی لایەنی خودایی-مەزهەبیبوونی شا دابەزی و ئەم دابەزینە و لاوازبوونە گەیشتە ئاستێک، کە گرژی و ململانێی نێوان هەوادار و لایەنگرانی شا سمایلی لێ کەوتەوە.

وڵاتە ئەوروپاییەکانی ترسی بەرینبوونەوەی دەسەڵاتی عوسمانیان رێنیشتبوو و هەر بۆ ئەوەش کە، لەگەڵ سەفەوییەکان بەگژ یەکتریاندا بکەن رێگەی شەڕیان هەموار کرد. ناردنی باڵوێز و نوێنەری وڵاتەکانیان بۆ

دەرباری سەفەوی خۆی ڕێگەخۆشکەری بەدیهاتنی ئاواتەکەیان بوو. بەدوای لاڕێ بوون و ملکەچنەبوونی سەرکردەی ناوچە جیاجیاکان لە وڵاتی ئێران بۆ وێنە لادان و سەرپێچیکردنی میرخان موسەلو، کە جێگری تەهماسوب میرزا بوو لە خۆراسان، دەرفەتی بۆ بێگانەی وەکو عەوڵا خانی ئۆزبەک ڕەخساند، کە هێرش بکاتە سەر وڵاتی ئێران و خۆراسان داگیر بکات. گوێپێنەدانی شا سمایل بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات پاش شەڕی چاڵدێران زنجیرەیەک نارەزایی و بزووتنەوەی ناوخۆی لێ کەوتەوە، کە تێکهەڵچوونەکانی نێوان هۆز و عەشیرەتی قزڵباشان خۆی وێنەیەک بوو لە ئاژاوە و بشێوی ناوخۆ.

لە روانگەی سیاسییەوە، شەڕی چاڵدێران، بوو بەهۆی کەمبوونەوەی پانتایی دەسەڵاتی حوکمەتەکەی سەفەوی، تێکشکانی گەورەیی و مەزنی ئیمپراتۆری سەفەوی، شکانی دەسەڵاتێکی شیعە لە بەرامبەر دەسەڵاتێکی سوننەدا، لاوازبوون و دابەزینی ئیرادەی سەربازی قزڵباش و بەرزبوونەوە و گەشانەوەی ئیرادەی سەربازی یەنیچری. لە روانگەی کۆمەڵایەتیشەوە بوو بەهۆی سەرهەڵدانی بشێوی و ئاڵۆزی لە وڵاتدا، کەمبوونەوە و دابەزینی جێگە و پێگەی شا لە نێو دەسەڵاتدا، سەرهەڵدانی ململانێی ڕەفتار و هەڵسوکەوت لەناو رۆح و دەروونی شا سمایلدا، گوێپێنەدانی شا سمایل و خۆدوورەپەرێزکردن بۆ کاروباری کۆمەڵایەتی و سەرەڕۆیی و لادانی خەڵک لە قانوونی وڵات.

# پێڕستی سەرچاوەکان


١- ارغندی، سیاست خارجی ایران از صفویه تا امروز، نوشته شده توسط رضا دلاوری در یکشنبه بیست و سوم دی.

به آدرس: .Blogfa.Com46.Http//Delavari

٢- پارسا دوست، منوچهر. درسی گرانقدر از شاه عباس اول. دوماهنامه فرهنگی، هنری دوماهنامه بخارا ساڵ دهم، سماره ٢ (پیاپی ٦٠)، فروردین و اردیبهشت .١٣٨٦

٣- سرافرازی عباس، نقش طایفه تکلو در تثبیت و تضعیف دولت صفوی تا پایان دوره شاه عباس اول مطالعات و پژوهشهای دانشکده ادبیات و علوم انسانی اصفهان، گروه تاریخ دانشگاه سیستان و بلوچستان، بهار ١٣٨٤.

٤- سلطانیان، ابوطالب، پژوهشی در روابط ایران و فرانسه در دوره صفویه، فصلنامه تاریخ روابط خارجی، شماره ٢٩، زمستان ١٣٨٥، ص.٤٣

٥- موسوی، مهدی روابگ ایران با اسپانیا و پرتغال از عصر شاه عباس اول تا سقوگ صفویان، مجله باستان شناسی و تاریخ، شماره ٣٨، پاییز و زمستان ١٣٨٣، بهار و تابستان ١٣٨٤، ص.٩

٦- نجفی، موسی، حقانی، موسی مشخصات سیاسی-اقتصادی جامعه صفوی کیهان شماره ٢٩١٨٧٤١/١١/.٨٥

٧- متی رودلف پ. (اقتصاد و سیاست خارجی عصر صفوی) ترجمه حسن زندیه از سوی پژوهشگاه حوزه و دانشگاه، .١٣٨٧

٨- حجازی فر، هاشم (شاه اسماعیل صفوی و جنگ چالدران، ناشر: سازمان اسناد ملی ایران).

۱۰- تحریکات قزلباشان در کشور عثمانی-جنگ چالدران و ازدست رفتن شمالغرب ایران، دانشنامه آزاد به آدرس:
http://fa.wikipedia.org/wiki2008
۱۱- جلیل زاده، غلا مرضا، چالدران و نبرد تاریخی آن، ۱۳۸۷ به آدرس:
http://www.iran-newspaper.com/1380/800119/html/iran.htm
۱۲- قدوسی، محمد رچا، صفویه=بحران تکلو ۱۳۸٤ به آدرس:
http://daneshnameh.roshd.ir
۱۳- ارزش تاریخی دوره صفوی دانشنامه ازاد به آدرس:
http://fa.wikipedia.org/wiki2008
۱٤- طلعت، وحید، چالدران، حماسه یا شکست؟!/ ۱۳۸۷ به آدرس:
http://www.hbayat.azerblog.com

# شەڕی چاڵدێران و ئاسەوارەکانی

عەباس جۆلفائی

**کورتە:**

ئیمپراتۆرە مەزنەکەی عوسمانی پاش داگیرکردنی قوستەنتەنیە بەدەستی سوڵتان محەمەدی فاتیحەوە لە سەدەی حەوتەم دامەزرا و، بوو بە بەهێزترین دەسەڵاتی ئیسلامی سوننە و پانتایی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی تاکو شازدە ملیۆن کیلۆمەتری دووجا بەرین کردەوە. دامەزرانی گەورەترین دەسەڵاتی ئیسلامی شیعە لە ئێرانی سەردەمی سەفەویدا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٩٠٧ک.م لەسەر دەستی سمایلی کوڕی حەیدەر بەدوای داگیرکردنی تەوریز و لەنابردنی میرنشینی ئاق قۆیونلودا.

لەم وتارەدا باس لەم بابەتانە دەکەین:

هەڵگیرسانی زنجیرە شەڕێکی سیاسی و مەزەبی و پەرەگرتنی ناتەبابییەکان بۆ ماوەی چوارسەدساڵ.

تەشەنەسەندنی دژایەتییەکان بە درێژایی چوارسەد ساڵ.

هۆکارەکانی روودانی شەڕی چاڵدێران جا چ لە بواری ئایدۆلۆژیایی یان لە بواری سیاسیی و ئابووریی ناوچەی ئاناتۆڵیا.

بەرینبوونەوەی ئەو هۆکارانە لە هەموو بوارەکاندا و ساردوسڕبوونەوەی پێوەندییەکانی نێوان حوکمەتی ئێران و عوسمانی بەدرێژایی دەسەڵاتی سەفەوییەکان.

بۆشایی لە پێوەندییەکانی زنجیرە دەسەڵاتەکانی دوای سەفەوی.

سیاسەتی شا تەهماسوب سەبارەت بە پاراستنی دەستکەوتەکانی شەڕی چاڵدێران.

واژۆکردنی گرێبەستی ئاشتی ئاماسیە لە ساڵی ٩٦٢ک.م و دان پیانانی شەرعی بوونی دەسەڵاتی سیاسی - مەزهەبیی حوکمەتی شیعە مەزهەبی سەفەوی لەلایەن عوسمانییەکانەوە.

پاراستنی سەربەخۆیی نەتەوەیی و مەزهەبی و سیاسی سەرەڕای هەندێک دەستتێوەردانی دەرەکی لە ناو ئێران.

## پێشەکی:

بێگومان، بەدرێژایی مێژوو لە هەر وڵاتێک هەندێجار دەرفەتی وا هەڵدەکەوێت، کە ئەگەر باش بقۆزرێنەوە دەکرێ ئیقبالێکی باش و داهاتوویەکی رووناک بۆ ئەو وڵاتە دەستەبەر دەکات. جا ئەو دەرفەتانە چ لە روانگەی زەمانیەوە بێت یان چ لە روانگەی هەڵکەوتەی جوگرافیاییەوە بێت. هەڵکەوتەی جوگرافیایی ئێرانیش دەچێتە ناو ئەو جۆرە بەرژەوەندییانە بۆ وڵاتان. ئێرانێک، کە کەش و هەوای ساڵانەی چوار وەرزە و بۆتە پردی رۆژهەڵات و رۆژئاوا و هەروەها بەدرێژایی مێژووی داگیرکەران تەماحیان لە خاکەکەی کردووە. دامەزرانی دەسەڵاتێکی بەهێز و سەربەخۆی شیعە مەزهەب لە پەنا زلهێزترین دەسەڵاتی سوننە مەزهەبی وشکەڕۆ باشترین دەرفەتی بۆ عوسمانیەکان رەخساند بۆ بەڕێوەبردنی سیاسەتەکانی خۆیان لەمەڕ داگیرکردنی ئێران و وەسەر خستنەوەی بۆ سەر ئیمپراتۆرییەکەیان. هەر ئەوەش وەزعەکەی وا لێ کرد، کە پێوەندییەکانی نێوان ئێران و وڵاتە سوننەکان هەردەم ساردوسڕ بێت و لێکمۆڕبوونەوە و ململانێ و جارجاریش شەڕوشوڕی پێوە دیار بێت.

### ١- دامەزرانی عوسمانییەکان:

لەدایکبوونی زنجیرە دەسەڵاتی عوسمانی و داگیرکردنی زۆرتری وڵاتە ئەوروپایی و ئاسیاییەکان یەک لە گرنگترین رووداوەکانی مێژووییە. لە سەدەی حەوتەمی ک.م. (١٣ز) لە نێوان چەندین میرنشینی تورکمان، کە دەوری ئیمپڕاتۆی هەڵوەشاوە و روو لە فەوتانی بیزانسیان دابوو، عوسمانییەکان دەسەڵاتێکی بچووکیان بەدەستەوە بوو، بەڵام چی وای پێ نەچوو، کە لە ماوەی دوو سەدەدا عوسمانییەکان دەسەڵاتەکەیان بەرین کردەوە و نەک هەر گشت وڵاتە داگیرکراوەکانی رۆمی رۆژهەڵاتیان ئەستاندەوە، کە دەکەوێتە باشووری رۆژهەڵاتی ئەوروپا و ئاناتۆڵیا، بەڵکو دەسەڵاتەکەیان پەلی هاویشتە سەر مەجار و وڵاتانی عەرەب و باکووری

ئەفریقیا و زۆر لە دەریاكانی دەوروبەریان، كە پێگەی جوگرافیایی گرنگیان بوو داگیر كرد و تا سەردەمی نوێ دەسەڵاتەكەیان لەپێ نەكەوت.

عوسمانییەكان لە رەچەڵەكی هۆزە خێوەتنشینی كوێستانەكانی ئاڵتای رۆژهەڵاتی قەراجەكانی نۆراسیان و لە باشووری چەمی یەنی سەنی و زەریای بایكاڵ نیشتەجێ بوون، كە بەشێكن لە مەغوستانی دەرەوە.[1] بەپێی بەڵگە مێژووییەكان و لێكدانەوە و توێژینەوەی هۆز و رەچەڵەک و دابونەریت و كلتوور و هەروەها بە لەبەرچاوگرتنی بنەچەكی كاربەدەستانی عوسمانی، دەچنەوە سەر تیرە و تایەفەی (قایی) ئەغوزەكان، كە بە ناوی باڵی راستی ئەم تایەفەیە واتە (گون خان) ناودەبران.[2]

عوسمانییەكان پاش لاوازبوونی دەسەڵاتەكەی ئاق قۆیونلو و تێكشكاندنی شا سمایل لە شەڕی چاڵدێران سنووری دەسەڵاتی خۆیان تا سنوورەكانی ئێستای ئێران بەرین كردەوە. ئەگەرچی تەورێز داگیركرا، بەڵام عوسمانییەكان تەورێزیان چۆڵ كرد و لە سەردەمی سوڵتان سلێمان، مەزنترین ئیمپراتۆرییان پێكهێنا، چونكە بێجگە لە ناوچەكانی ئێستای توركیا، باشووری رووسیا و باشووری ئەروپا و باكووری ئەفریقا و وڵاتانی عەرەبی وەكوو سیسر و عەرەبستان و شام و بەینولنەهرەین و بەشێكی ئازەربایجان و كوردستان و ئەرمەنستان و گورجستانیشیان داگیر كرد.[3]

## ٢- دامەزرانی دەسەڵاتی سەفەوی:

دوو بابەت بوونە بنەمایەک بۆ دامەزرانی دەسەڵاتی سەفەوی لە ئێران:

---

(١) جی شاو، استانفورد، تاریخ امپراطوری عثمانی و تركیه جدید، ترجمه محمود رمضان زاده آستان قدس رضوی، ١٣٧٠، ج١، ص٢١.

(٢) حقی اسماعیل، اوزون چارشی لی، تاریخ عثمانی، ترجه ایران نوبخت، كیهان ١٣٦٨، ج١، ص١١٧ و فن هامر پورگشتال، تاریخ امپراطوری عثمانی، ترجمه میرزا ولی آبادی، نوین ١٣٦٧، ج١، ص٤٣.

(٣) پارسا دوست، منوچهر شاه تهماسب هندی، شركت انتشار، تهران ١٣٧٥، ص٢٣٩.

١- شۆڕش و بزووتنەوە مەزهەبی-سیاسی و فکرییەکانی ئێران لە سەردەمانی پاش ئیسلام لە بەرامبەر سیستەمی خەلافەت و دەسەڵاتەکانی سەر بە خەلافەت لە ئێران.

٢- هێزی عێل و عەشیرەتەکانی ئاناتۆلیا، کە مورید و پێڕەوی خانەقای هەردەوێڵ بوون. لە لێکدانەوەکانی شوناسی سەفەوییەکان، چەمکی شەریعەت و تەریقەت و کاریگەریی ڕەوتە فکرییەکان و بزووتنەوە جەماوەرییەکان لە بەرامبەر حاکمانی زاڵم و ستەمکار جێگە و پێگەیەکی روون و بەرچاوی هەیە. بزووتنەوەکانی مەوالی و شۆڕشی موختار و ئەبو موسلیم و زیدییەکان و عەلەوی و دامەزرانی حوکمەتی فاتمی و شۆڕشی سەربەداران و سەیدەکانی هۆزی مازەندەران و هەروەها سەرهەڵدانی تەریقەتی بەکتاشیە و حروفییە، رێبازی فتووەت و عەیاران و جوامێران، خۆی لە خۆیدا هێمایەکە بۆ کاردانەوەکانی خەڵکی ئێران لە ئاست سیاسەتە توندئاژۆکانی سیستەمی خەلافەتی بەغدا و دەسەڵاتەکانی سەر بە خەلافەت. لەناوچوونی دەسەڵاتی بەغدا لە ساڵی٦٥٦ک.مدا. بە دەستی هۆلاکۆ خانی مەغۆل و لەناوچوونی بنکە و مەکۆی دژی ئازادیخوازی ئەوکات و سیاسەتی مەزهەبیی ئاشتیخوازانەی ئیلیخانییەکان، بواری گەشەی سەفەوی و موریدەکانی لە ئێران و دەرەوەی ئێرانی رەخساند.

شیعە پاش سەردەمێکی کورت لە بەرەبابی بویەوە، ئەو هەڵەی بۆ رەخسا بوو، ، کە بە ئاسوودەیی بۆ شیعە بانگەشە بکات، بۆ پەلوپۆدەرکردن و ریشەداکوتان مەیدانی بۆ چۆڵ کرابوو. لە سەردەمی ئیلخانییەکاندا، سوڵتان تگودار ناسراو بە ئەحمەد[١] و غازان خانی ناسراو بە مەحمود، ئایینی ئیسلامیان قبوڵ کرد[٢] و ئەلجاتیو (سوڵتان محەمەدی

---

(١) بیانی، شیرین، ص١٩١، مغولان و حرکت ایلخانان، تهران، سازمان ترویج، دانشگاه، ١٣٧٩، ص١٩١. نقل از امپراطوری صحرانوردان، ص٦٥٦.

(٢) رشید الدین فضا الله، جامع التواریخ (بخشی از تاریخ مبارک فازانی) به سعی و اهتمام کارل یان، هرتفورد، ١٣٥٨ همچنینو بیانی، شیرین، پیشین، ص٢٠٨.

خودابەندە) هەر لە سەرەتاوە دەسەڵاتی شیعەی قبووڵ کرد و بۆ پەرەپێدان و بانگەشەی ئەو ڕێبازەی ئیسلام هەوڵی خۆی دا، هەر لەو دەمەوە بوارێکی گونجاو بۆ گەشەی ڕێبازی شیعە پێک هات.[1] هەروەها بوونی هەندێک کەسایەتیی ناوداری وەکو ابن المطهر الحلی ( ئیبنولموتە هەرولحەلی) (پێشەوایەکی شیعەی دوازدە ئیمامە)، کە کاری کردە سەر ئەلجاتیو و محەمەد کوڕی مەکی ئەلعالەمی، کە عەلی مویەدی سەربەداری وەرگرت و چووە سەر ڕێبازەکەی و ئەویش کتێبی (لمعە دمشقیە) لەمعەهودیمێشقیەی بۆ نارد. هەروەها هەوڵەکانی ئیبنی فەهدولحەلی لە سەردەمی دەسەڵاتی جەلایەری و قەراقویونلوەکان بۆ ڕاکێشکردنی سەرکردەکانی تورکمان بۆ ڕێبازی ئایینی شیعە، بەگشتی هەمویان بوونە هۆی پەرەسەندن و گەشەی شیعە. سەرهەڵدان و بنیاتنرانی دەسەڵاتی شیعەی سەربەداران و حوکمەتی سیدەکانی سەر بە مەرعەش لە مازەندەران و حوکمەتی سەیدەکانی سەر بە کیا لە گێلان و مایلبوون و سەرنجدانی دەسەڵاتدارانی قەراقۆیونلو بۆ ئایینی شیعە دەستکەوتی ئەو پەرەسەندن و گەشەکردنە بوو.[2]

هەڵبەت زوڵم و زۆر و گەندەڵی ناو سیستەمی خەلافەت، کە بێجگە لە عەرەب، هەموو هۆز و نەژاد و تیرە و تایەفەیەکی لا سووک و بێنرخ بوو و لەسەر ئەوەشڕا لەبەر دەوڵەمەندبوونی فەرهەنگ و کلتوور و مەزهەبی وڵاتە ئیسلامییەکان و بەتایبەت ئێران ملیان نابوو لە تاڵان و بڕۆی سەروەت و سامانی خواپێداوی ئەو هۆزانە و جەوهەر و ڕەگی نەتەوەیی و ئایینییان تێدا وشک دەکردن و پەلی زوڵم و ستەمیان داویشتە سەر ئەو وڵاتانە، هەمووی مێژووییەکی تۆمار کرد، کە ئەو گەلانە بۆ هەڵاتن و

---

(١) وصاف الحضر، فضل الله بن عبدالله شیرازی، تجزیه الامصار و ترجمه الاعصا (تاریخ وصاف و...) به اهتمام محمد اصفهانی، ج٣، ص٤٧١.

(٢) پارسا دوست، منوچهر، تاریخ شاه اسماعیل، تهران، انتشار ١٣٧٥. ص٩٣ تا ٩٩. غفاری قزوینی، قاضی احمد بن محمد، تاریخ جیهان آرا، تصحیح حسن نراقی، تهران، انتشارات حافظ ١٣٤٣، ص٢١٤.

دەربازبوونیان لە چنگ کۆت و یاسای کۆیلەبوونی عەرەب هەر جارناجارێک لە هەلێکدا سەربزێوییان دەکرد، تاکو لە ئاکامدا گشتیان پاڵیان وە پاڵ شیعەوە دا و هاتنە سەر ڕێبازی شیعە و بەو بیانوویە توانیان بۆ هەمیشە لە چنگ عەڕەب و ئەهلی سوننە نەجاتیان بێت.

لەگەڵ ئەو گشتە گۆرانە ڕێبازی سۆفییەش وردەوردە لە زۆر کانی خۆی پاراو دەکرد و ڕەنگیکی زولاڵی دەنواند و بۆن بەرامەیەکی تازەی دا بە گۆڕانە فەرهەنگی و مەزهەبییەکانی ئێران. تەسەوف واتە سۆفیگەری، کە لە خواپەرستی و خۆشەویستی خوداوە هەوێنی گرتبوو، وردەوردە پەرەی دەگرت و ڕێبازی پاکبوونەوە و دەستەمۆکردنی خواستە شەیتانییەکانی مرۆڤ و بەربەرەکانی لەگەڵ قەید و بەندی دنیاخوازی بۆ گەیشتن بە دیوانی خوداوەند و دەربازبوون لە کۆت و بەندی پارەپەرستی و ماڵپەرستی، بوو بە جۆرێک بەربەرەکانێی شاراوە لە بەرامبەر زوڵم و زۆری کۆمەڵگا و گەندەڵی و سیستەمی دەسەڵاتداران و هەر ئەو ڕێبازەش لەناو کلتوور و فەرهەنگی ئێراندا ڕەنگی دایەوە. لە سەردەمی مەغۆڵ و تەیموور، خانەقا بوو بە پەناگای هزری خەڵکانی زۆرلێکراو و لێقەوما و ڕووناکبیر. بوونی خاڵی هاوبەش لە نێوان شیعەگەری و سۆفیگەری و ڕێکخراوەکانی ئەهلی فتوەت و جوامێران و عەیاران و ئەخییەکان بۆ شەڕ و ململانێ لەگەڵ زۆردار و زاڵم و بەتایبەت خاڵی هاوبەشی ئەوان سەبارەت بە خۆشەویستی گشتیان دەرحەق بە ئیمامی عەلی، کە پێشەوای ئەم ڕێبازە و ئالاهەڵگری شیعە بوو، وردەوردە ئەو ڕێژگانەی لێک نزیک کردەوە و خستنیەوە سەر یەکتری. لە سەدەی هەشت و نۆی ک.م. گرو و تاقمی بەکتاشیە و حروفییە، کە دوو ڕەوتی جیابۆوە لە شیعە بوون، بە شێوەی جۆراوجۆر چوونەوە سەر ڕێبازی خۆیان واتە شیعە.[١]

---

(١) سومر، فاروق، نقش ترکان آناتولی در تشکیل و توسعه دولت صفوی، ترجمه احسان اشراقی و محمد تقی امامی، نشر گسترده تهران، ١٣٧١، ص١٥-١٧.

پێرەوانی حاجی بەکتاش لەبەر نالەباربوونی بارودۆخی ئێران، روویانکردە ئاناتۆلیا و رابەرانیان دەستیان دایە دامەزراندنی تۆڕێکی نهێنی بۆ پەرەپێدانی رێبازەکەیان.

پەیڕەو و رێبوارانی رێبازی حروفییەش پاش کوژرانی رابەرەکەیان واتە فەزلولڵا ئیسترئابادی بە دەستی تەیموور، بەرەو ئاناتۆلیا ئێرانیان بەجێ هێشت. لەلایەکی تریشەوە، وڵاتی ئاناتۆلیا، کە هەر لە سەردەمی سلجوقییەکانەوە ببوو وڵاتێکی ئاوارەگر و نیشتمانی کۆچبەران، یارمەتیدەری رێبازە فکرییە نوێیەکان بوو. ئەژمارێکی زۆر لە هۆز و ئایینی جیاجیا لەو وڵاتە بوو بە هۆکارێک، کە شیعەکان بتوانن پێگەی خۆیان لەوێ قایم بکەن و دانیشتووانی ئەو ناوچەیە دژی دەسەڵاتی ئایینیی هان بدەن.[١]

لە سەردەمی سلجوقییەکان، لەبەر ئەوەی رۆمییەکان لاگری فەرهەنگ و کلتووری ئێران بوون، زمانی فارسی بوو بە زمانی دەسەڵاتدار و هەر ئەوەش هێز و پێزی پێ بەخشی و گەشەی کرد و وردەوردە کەش و هەوای فەرهەنگی و ئەدەبی و تەنانەت دەسەڵاتدارییەتیی ئاسیای بچووکیشی لە سەردەمی سەلجوقی و ئیلخانییەکانی مغۆل و ئیمپراتۆری عوسمانی خستە ژێر سەیتەرەی خۆی و کاری تێ کردن.

هاوکات لەگەڵ پەرەوازەبوونی ئێرانییەکان بۆ ئاسیای بچووک، وردەوردە پۆلپۆل خەڵکی کۆچەری تورکی ئاسیای ناوەڕاست لە ئاناتۆلیا گیرسانەوە. بە پێچەوانەی ئیرانییەکان، کە لە شارەکانی ئەو ناوچەیە نیشتەجی بوون، کۆچەرانی تورکیش لە وڵاتە کوێستانییەکان تێکەڵاوی ژیانی ئاژەڵداری بوون. لەگەڵ پەرەسەندنی رێژەی جەماوەری عەشیرەت و هۆزی تورک و نیشتەجێبوونیان لە دێهات و زۆزانی ئەم کوێستانانە، بەرەبەرە دوو جۆر ژیان و دوو جۆر فەرهەنگ و کلتوور لە ناوچەی

---

(١) گلپنارلی، مقاله قزلباش در دایره المعارف اسلام، چاپ استانبول نقل از، محمدامین ریاحی، سفارتنامەهای ایران، انتشارات توس، تهران، ١٣٦٨، ص٣٤. پارسا دوست، منوچهر، شاه تهماسب، انتشار، تهران، ١٣٧٧، ص١٣٧ تا ١٤٤.

ئاناتۆلیا خۆی نواند. فەرهەنگی شاری و فەرهەنگی دێهاتی-عەشیرەیی-. سوڵتانەکانی رۆم هەر لەسەر رەوتی سوڵتانە مەزنەکان، سیستەمی دەسەڵاتداریەتییەکەیان بە چەشنی سیستەمی دەسەڵاتداریەتی دەرباری ئێران دارِشت و مەزهەبی سوننە وەکو ئایینی دەسەڵاتدار، تێکەڵی سیاسەتی بەرِێوەبردنی ئیداری و کۆمەڵایەتیی وڵات بوو. لەو هەلومەرجەدا، جۆرێک دووبەرەکایەتیی مەزهەبی و سیاسی لە نێوان شار و دێهات کەوتەوە و فەقیر و بێداهاتی عێل و هۆز و عەشیرەتە کۆچەرەکان لەرِووی دەوڵەمەند و دەسەڵاتداری چین و توێژی ناو شار وەستانەوە و دەنگی نارِەزایی گوندنشینان و کۆچەران، دەرفەتی چاکی بۆ بانگەشەی رێبازی تەریقەت و سۆفییەکان و هێمای رزگاریدەری تاقمەکانی (شیعە) بەتایبەت (شیعەی غالی) رەخساند. گەورە و سەرۆک هۆزی عەشیرەتەکان، کە بە واتای خۆیان جلی (بابا) یان لەبەر کردبوو، هەر دەچوونەوە سەر هەمان رێگا و رێبازی (شمەن)ەکانی ئاسیای ناوەرِاست. عەشیرەتە کۆچبەرەکان، ملکەچ بوون لە بەرامبەر باباکاندا، بە واجیب دەزانی و هەر ئەوانە دواتر بوونە رابەری ئایینی و سیاسی. بزوتنەوە و شۆرِشی باباکان لە سەدەی حەوتەمدا هەر بەرهەمی رابەرایەتی ئەو پێشەوا و رابەرانە بوو و بە یارمەتیی عێل و عەشیرەت و رەوەندی نارِەزا لە دەسەڵات سەری گرت... ئەگەرچی ئەو جۆرە بزووتنەوانە لەلایەن سەلاجق و خانانی مەغۆل سەرکوت دەکرا، بەڵام بیرەوەری و کاریگەرییەکانی لەناو دڵ و زەینی عەشیرەتە کۆچەرەکان و مەرِدارانی گوندنشین هەر دەمایەوە و دواتر بۆوە بە هەوێنی شۆرِشەکانی داهاتوو. قایم بوون و پتەوبوونی جێگە و پێگەی گروی بەکتاشیە و شیعە لەنێو ئەو کۆچەرانە، وردەوردە بەرەو رێبازی شیعە و رێبازەکانی هاوبیری شیعە هانی دان. ئاورِدانەوەیەکی کەمیش لەسەر بیروباوەرِی تورکی ئاناتۆڵیا ئەو راستییە دەردەخات، کە تا چ رادەیەک ئەو جۆرە بیروباوەرِە هەر لە بیروباوەرِی ئایینی و فکری ئێرانەوە هەوێنی گرتووە.[1]

---

(١) سومر، فاروق، پیشین، ص١٨-١٩.

شا سمایل سەفەوی، زنجیرە دەسەڵاتی سەفەوی لە ساڵی ٩٠٧ک.م/١٥٠٢ز دامەزراند و بەناوی باپیری واتە سەفیەدینی ئەردەویڵی ناودێری کرد. شێخ سەفی، کە لە شێخەکانی سۆفییە بوو، رەچەڵەکی خۆی بەم جۆرە لێک دەداوە، کە دەچێتەوە سەر تۆرەمەی ئیمامی حەوتەم و هەر لەوێشڕا دەگاتەوە ئیمامی عەلی واتە کوڕە مام و زاوای پێغەمبەری خودا.[١]

لە سەردەمی ژیانی شێخ سەفیەدین و تایەفەی شێخ، هەندێک کەس لە بانگەشەکارانی خانەقا بە نێوی (خەلیفە)، (بابا)، (پیرە)، (ئەخی) لە نێوان هۆزە کۆچبەرەکانی تورک و تورکمانی ئاناتۆلیا ملیان نابوو لە بانگەشەی ئایینی شێخ سەفی. ٨٥١ک.م/١٤٢٧ز کاتێک بەرماڵی تکیە و خانەقا بە شێخ جونەید کوڕی شێخ سەدرەدین برایم بڕا، ئەوکات شیعەی دوازدە ئیمامە لە خانەقای هەردەویڵ پێگەیەکی قایمی بوو. بانگەشەی شیعە تەشەنەی سەند و نێردراو و پەیامنێرانی تەریقەتی سەفەوی، ناوچەکانی نیشتمانی کۆچبەرانی ئاناتۆلیایان کردە بنکە و مەقەڕی رابەرانی خانەقای هەردەویڵ. لەگەڵ ئەوەی شێخ جونەید پێی نایە گۆڕەپانی ململانێی سیاسی ئەوکات، بەتایبەت ململانێییەک، کە لە نێوان ئۆزۆن حەسەنی ئاق قۆیونلو و جەهانشا قەراقۆیونلو لە ئارادا بوو. ڕێبازی ئەو تەریقەتە کەوتە ناو رەهەندی سیاسی و سەربازییەوە.[٢]

لەمەو بە دوا بانگەشەی ئایینزا، کە بە شێوەیەکی ئاشتیخوازانە بەڕێوە دەچوو، پێی نایە رەهەندی بانگەشەی سیاسییەوە و شازادەکانی قەراقۆیونلو، کە لە باکووری ئێران حوکماتیان دەکرد ترسیان ڕێ نیشت.

جەهانشا قەراقۆیونلو دەیگوت دوو شمشێر لە کالانێکدا جێیان نابێتەوە. هەر بۆیە هەوڵی دا جێگە و پێگەی خانەوانی سەفەوی کاڵ بکاتەوە و ببێتە

---

(١) هینتس، والتر، تشکیل دولت ملی در ایران، ترجمه کیکاووس جهانداری، تهران، کمسیون معارف، ١٣٤٦، ص١. اسماعیل لە ٩٠٧ک.م تاجی پاشایەتی لەسەر ناوە، جهانگشهای خاقان، ص١٥٠. حسن روملو، ص٦٠. یحیی قزوینی، ص٢٤١.

(٢) سومر، فاروق، پیشین، ص١٩.

لەمپەری بەرینبوونەوەی دەسەڵاتیان. ئەو شێخ جونەیدی مەجبوور کرد هەردەوێڵ بەجێبهێڵێت، شێخ جونەید پاش ماوەیەک ئاوارە بوون و بێماڵوحاڵی، رووی کردە دیاربەکر و پەنای بردە بەر ئۆزۆن حەسەن.

ئۆزۆن حەسەنیش لەبەر ئەوەی دانووی لەگەڵ خانەدانی قەراقۆیونلو نەدەکولا و نێوانیان ناخۆش بوو، بە دڵێکی کراوە و ئامێزێکی گەرمەوە باوەشی بۆ کردەوە و خوشکەکەشی لێ مارە کرد.[١]

کە رۆستەم بەگ دەسەڵاتی هۆزی مەرە رەشانی (قەرە قۆیونلو) گرتە دەست ٨٩٧-١٤٩٢/٩٠٣-١٤٩٧ز کوڕانی حەیدەری ئازاد کرد و بە یارمەتیی عەلیی کوڕە گەورەکەی سوڵتان حەیدەر، کە جێگری باوکیشی بوو -سوڵتان عەلی- بایسنقری تێک شکاند، کە داوای یارمەتی لە شەڕوانشا کردبوو و پاش ئەوەی ئەو دوژمنەشی لەسەر ڕێیە سڕییەوە، سەربەرزانە رووی کردە تەورێز و کورسیی دەسەڵاتی بۆ خۆی گرتەوە و ڕێزێکی زۆریشی لە سوڵتان عەلی نا و ناردییە هەردەوێڵ. چی وای پێ نەچوو، کە مورید و پێڕەوی سەفەوی هەمدیسان لە سوڵتان عەلی هالانەوە و دووبارە چەرخی بزووتنەوەی سەفەوی وەکار کەوتەوە. لەم لاشەوە، رۆستەم بەگی ئاق قۆیونلوش هیچ دڵی بە دوارۆژی ئەو رووداوانە خۆش نەبوو و بۆ ئازادکردنی کوڕانی حەیدەر پەشیمان ببۆوە، بەڵام تازە لە دەستی دەرچووبوون و هەربۆیە بڕیاری دا سوڵتان عەلی بکوژێت و لەناوی بەرێت و بۆ ئەو پیلانەش سوپایەکی ناردە سەر سوڵتان عەلی.[٢]

پاش بە کوشت چوونی سوڵتان عەلی و مردنی برایم، بۆ ئەوەی بەرماڵی مێحراب چۆڵ نەبێت، سمایلیان هەڵبژارد و قەلەکە لەسەر شانی سمایل نیشتەوە. سمایل لەبەر دەستی میرزا عەلی کارکیا و براکەی سوڵتان حەسەن بۆ ئەو مەبەستە پەروەردە دەکرا. بەو جۆرە سمایل لە چنگ

---

(١) پارسا دوست، منوچهر، شا اسماعیل همان، ص١٣٢ تا ١٤٣.

(٢) خواندمیر، امیر محمود، ایران در روزگار شاه اسماعیل و شاه تهماسب، بە کۆشش غلام رضا طباطبایی، تهران، ١٣٧٠، ص٨١.

شمشێری ئاق قۆیونلو دەرباز بوو. (بە ماوەی شەش ساڵان لە گێلان مایەوە...).[١] سمایل بە یارمەتیی حەوت کەس لە یاران و دۆستانی وەفاداری باوکی و لەگەڵ ئەوەی های لە هەلومەرجی ئاڵۆز و بشێوی نێوان جێگران و میراتگرانی یاقوب بەگی ئاق قۆیونلوی بوو، گێلانی بەجێ هێشت و بەرەو هەردەوێڵ بۆی دەرچوو.[٢] لەو نێوەدا زیاتر لە هەزاروپێنجسەد کەس لە هاورێیانی باوکی رەگەڵی کەوتن و خەڵکانێکی زۆریش لە ئاناتۆڵیا و ناوچەکانیتر خۆیان گەیاندە سمایل.[٣] سمایل پاش پەلاماردانی شەروان و کوشتنی فەروخ یەسار و و دەست بەسەرداگرتنی خەزێنە و تالآنی سەروەت و سامانەکەی فەورخ و تەیارکردنی هێزەکەی خۆی و ناوچەکانی بن دەستی بەو غەنیمەتە، قەلا بەناوبانگەکەی شماخ و باکووری داگیرکرد و خۆی گەیاندە گورجستان و هەوای داگیرکردنی ئازەربایجان و گرتنی ناوچەکانی بن دەستی ئاق قۆیونلوی کەوتە سەری و لە نەخجەوان هێزی ئەلوەند میرزای تێک شکاند و دەرگای تەورێزی ئاوەڵا کرد.[٤]

شمشێری تۆڵە، دوژمنی راونا و تاروماری کردن و پەڕو پۆی پێوە نەهێشتن... میرزا ئەلوەند کونە مشکی پێ تەنگ بوو، ترس و خۆف داوێنی گرت و گۆڕەپانی چۆڵ کرد و هەڵاتن بوو بە رێبازی و بەرەو ئازەربایجان رەوی بەست.[٥]

تێکشکانی ئاق قۆیونلو و گرتنی تەورێز بەدەستی سمایل لە ساڵی ٩٠٧ک.م/١٥٠٢ز لە هەرە گرنگترین رووداوەکانی مێژووی سەفەوییە. چونکە

---

(١) ترکمان، اسکندر بیک، تاریخ عالم آرای عباسی، امیر کبیر، ١٣٣٤، ص٢٥ تا ٢٦.

(٢) گاهری، ابوالقاسم، تاریخ سیاسی و اجتماعی ایران، تهران، شرکت سهامی کتابهای جیبی، ١٣٤٩، ص١٦٨.

(٣) سیوری، راجر، ایران عصر صفویه، ترجمه احمد صبا، تهران، ١٣٦٣، ص٢٢.

(٤) پارسا دوست، منوچهر، شا اسماعیل، پیشین، ص٢٥٠ تا ٢٦٢.

(٥) خواندمیر، امیره حمود، تاریخ شا اسماعیل و شاه تهماسب صنوی، ژیل تاریخ حبیب السیر به اهتمام محمد علی جراحی، نشر گسترده، ١٣٧٠.

سمایل پاش تاجلەسەرنانی سەردەرانەی مزگەوت و مێحرابی مزگەوتەکانی بە (لا اله الا الله محمد رسول الله و علی ولی الله) رازاندەوە.[1] چونکە بەو کارەی هۆز و قەومە جۆراوجۆرەکانی قزڵباشی لێکدا و هەر ئەو کارەشی بوو بە هەوێنی دامەزران و بنیاتبوونی یەکەم دەسەڵاتی سەربەخۆی ئێران لە پاش ئیسلامەوە.

**٣- پێوەندییە سیاسییەکانی شا سمایل لەگەڵ عوسمانی:**

پاش رووخانی دەسەڵاتی ساسانییەکان و دوای سەقامگیر بوونی ئیسلام لە ئێران بناغەی پردی پێوەندییەکانی دەرەوەی ئێران و عوسمانی نەوژەن کرایەوە ئەویش لە سەردەمی سەفەویدا و بەتایبەت ئەو دەمەی شا عەباسی یەکەم حوکماتی دەکرد. خۆی، هەر لە سەرهەڵدانی ئیسلام و دامەزرانی حوکمەتەکانی بنی ئومەیە و بنی عەباس تاکوو سەردەمی هێرشی مەغۆل بۆ ئێران پێوەندییەکی رێکوپێک لە نێوان ئێران و وڵاتانی دیکەی جیهاندا بەتایبەت ئەوروپا نەبووە.[2]

لە بەرەبەیانی سەدەی نۆیەمی کۆچی مانگی بەدوای لاوازبوونی دەسەڵاتی تەیمووررییەکان و میرنشینەکانی ناوخۆ (ئاق قۆیونلو و قەرەقۆیونلو) و شەری ناوخۆیی و پەرەسەندنی زوڵم و زۆر و فەساد، رایەڵ و پۆی سیستەمی دەسەڵات لێک ڕەوی و وڵات کەوتە و پەرەن پەرەن بوون گیانەلایە.

لەلایەکەوە دەنگی ناڕەزای خەڵکی لە ئاست زوڵم و ستەمی لەمێژینە و ئۆگری و خۆشەویستی جەماوەری خەڵکی دەرحەق بە قوتابخانەی موریدانی سەفەوی، سەبارەت بەوەی لە رەچەڵەکی خانەدانی پێغەمبەر و لە

---

(١) روملو، حسن بیک، احسن التواریخ، به تصحیح عبدالحسین نوایي، تهران، بابک، ١٣٥٧، ج٢، ص٨٦.

(٢) میتن دفتری، احمد، روابط بین المللی از قدیم ایام تا سازمان ملل متحد، دانشگاه تهران، ١٣٤٦، ص١٧٦.

تیرەی ئیمامی عەلی بوون، لەلایەکیترەوە، بارودۆخێکی لەبارو گونجاوی بۆ بزووتنەوە و هاتنی شا سمایل بۆ گۆڕەپانی سیاسیی-مەزهەبیی ئێران رەخساند.[1]

ئەگەر لە پەنجەرەی سیاسەتی دەرەوە بڕوانین، دەرکەوتنی خۆری دەسەڵاتە مەزهەبیی-سیاسییەکەی سەفەوییەکان، کە هاودەم بوو لەگەڵ گرتنی قوستەنتینیە بەدەست سوڵتان محەمەدی دووەم ناسراو بە فاتیح، پێوەندییەکانی نێو وڵاتانی بەتەواوی گۆڕی و دیارە شەپۆلی ئەم گۆڕانەش، ئێرانی گرتەوە. ئەودەمی تورکی عوسمانی، ئیمپراتۆرییەکی بەهێزیان پێک هێنا و خۆشیان بە میراتگر و کەلەپۆرگری خەلیفەکانی ئیسلام دەزانی و هەر لەسەر سروشتی پاوانخوازی خۆیانڕا، هەوای داگیرکردنی تەواوی وڵاتە ئیسلامییەکانیان لەسەر دابوو. کەش و هەوای تاریک و لێڵ و بارودۆخی نالەباری ئەوکاتی ئێران، دەرفەتێکی گونجاوی بۆ گەیشتن بەو ئامانجەی عوسمانی هێنابووە دی و دەیانتوانی پلانە پاوانخوازەکانی خۆیان بەڕێوەبەرن. هەر لەو کاتەدا، کە ئێران وەپەلەقاژە کەوتبوو دەسەڵاتەکانی دراوسێی ئێران واتە عوسمانی لە رۆژئاوا و ئۆزبەک لە باکوور و رۆژهەڵات و گورکانیەکانی هێندوش لە باشووری رۆژهەڵات لەسەر ترۆپکی هێز و کامڵبوونی سیاسی چاویان بڕیبووە وڵاتە بێدەسەڵاتەکان. ئێرانی پەرپەرکراو و لەپێکەوتووش لە نێوان ئەم سێ زلهێزەدا بڕستی لێ بڕابوو، بەڵام شا سمایلی سەفەوی، پێڕەوی قوتابخانەی شێخ سەفیەدینی هەردەوێڵی، لەناو دڵی پێویستییە مێژووییەکان و هۆکارە کاریگەرەکانی کۆمەڵایەتی ئێران راساو بە دژی میران و پاشایانی ئەو زلهێزانە و ئەو داگیرکەرانە راپەڕی و تان‌وپۆی وڵاتی دادڕدادڕی هۆنییەوە و وڵاتێکی یەکپارچە و قایمی بنیات نایەوە. یەکپارچەبوونێک، کە بەهۆی فەرمیبوونی شیعە، هەم لە روانگەی رۆحانییەوە و هەمیش لە روانگەی بیروباوەڕەوە

(١) سیوری، راجر، همان، ص٢٤.

خۆی قایمتر دەکرد و هەر ئەوەش لە ئاست هێرشی وڵاتەکانی بێگانە بەهێزتری کرد و ئەوەش ڕەنگوبۆیەکی تایبەتی دا بە سەربەخۆیی ئێران.

سەردەمی دەسەڵاتدارییەتی شا سمایل ڕێکەوتە لەگەڵ سەردەمی دەسەڵاتدارییەتی بایەزیدی دووەم (٨٨٦ تا ٩١٨ک.م/١٤٨١-١٥٢١ز) و سەلیمی یەکەم (٩١٨-٩٢٦ک.م/١٥١١-١٥٢٠ز) و هەروەها چوار ساڵانی سەرەتای دەسەڵاتدارییەتی سلێمان (٩٢٦-٩٣٠ک.م/١٥٢٠-١٥٢٤ز).

شا سمایل پاش داگیرکردنی بەغدا و شارەکانی دەوروبەری (٩١٠ک.م/١٥٠٤ز) نێردراوێکی بە دیاری زۆرەوە ناردە دەرباری سوڵتان بایەزید و هەواڵی گرتنی بەغدای پێ ڕاگەیاند.(١)

سوڵتان بایەزید پاش کۆکردنەوەی زانیاری سەبارەت بە چۆنیەتی وەزعی دەرباری ئێران و سەرکەوتنەکانی شا سمایل و لێکدانەوەکانی لەسەر میرانی ئاق قۆیونلو، کە بەرەو رووخان هەنگاویان دەنا و پتەوبوونی دەسەڵاتی پاشای سەفەوی، دەستبەجی سەری خۆی خوێندەوە و بە ناچاری دەرگای ئاشتیخوازی بۆ پێوەندییە سیاسییەکانی شا سمایل کردەوە. بایەزید (٩١٠ک.م/١٥٠٤ز) محەمەد چاووش باڵابانی وەکوو باڵوێز بە دوو نامەوە ناردە دەرباری سمایل، کە لە نامەیەکیاندا پیرۆزبایی سەرکەوتن و دامەزرانی دەسەڵاتی سەفەوی لێ دەکا و نامەکەیتریش بە گلەیی و گازندە و سەرکۆنەی دۆستانە و پەند و نەسحەتی پیرانەی سەبارەت بە توندوتیژییە مەزهەبییەکانی شا بڕایەوە.(٢)

شایانی باسە، کە ئەوکات سوڵتان بایەزیدی دووەم لەبەر شۆڕش و ڕاپەڕینی براکەی و گرژبوون و پسانی پێوەندییەکانی لەگەڵ میسر و کۆماری ڤێنیز پێیەکی شەل بوو و بێگومان ئەگەر دژی ئێرانیش بووایە ئەوا کێشەکانی ئەوەندەیتریش ئاڵۆزتر دەبوون.

---

(١) حقی، اسماعیل، اوزون چارشلی، تاریخ عثمانی، ج٢، ص٢٤٤.

(٢) پارسا دوست، منوچهر، پادشاهی شاه اسماعیل اول، تهران، انتشار، ١٣٧٥، ص٣٥٦ و ص٣٦٣.

بەپێی ناوەڕۆکی نامەکانی هەردووک دەربار، کە بۆ یەکتریان ناردووە هەردووک لا هەوڵیان داوە پێوەندییەکانی نێوان خۆیان خۆشتر پتەوتر بکەن، چونکە لە نامەیەکدا شا سمایل داوا لە سوڵتانی عوسمانی دەکات، کە ڕێگەی هاتوچۆی لایەنگر و مورید و خەلیفەی تورک بدات، کە بۆ زیارەتی ئەو (شا سمایل) دەچوونە هەردەوێڵ. ئەو نامانە بە زمانی فارسی نووسراون و ڕێکەوتێکی دیاریکراویان نییە و بەلاّم لەو ڕوانگەیەوە، کە دەریدەخات ئەژماری سۆفییەکانی ئێرانی لەناو وڵاتی عوسمانی چەندە زۆر بوون، خۆی بەڵگەیەکی گرنگە.(١)

بەو جۆرە تاکو (٩١٦ ک.م/١٥١١ز) پردی پێوەندی سیاسی نێوان ئێران و عوسمانی بە ڕواڵەت لەسەر بنەمای ئاشتی دامەزرا، هەر بە نامەی دۆستانە و بەڕواڵەت بە ڕێز و حورمەتەوە بڕایەوە، بەلاّم کاتێک شا سمایل هەر لە سەرەتاکانی ئەو ساڵە شیبەک خانی تێک شکاند، بایەزیدی نیگەران و تووڕە کرد. لەم لاشەوە، هێرشەکانی شازادە سەلیم بۆ سەر سنوور و هەڵسووکەوتی ساردوسڕی دەرباری عوسمانی لەگەڵ نێردراو و نوێنەرانی شا سمایل و راپەڕینی هۆزە جۆراوجۆرەکانی ئاناتۆلیا-بۆ وێنە تەکەلویەکان، کە شاقوڵی خەلیفە رابەرایەتی دەکردن و بەلاّم بەنهێنی لەباری رۆحی و سیاسییەوە دەرباری سەفەوی لە پشتیان بوو- و بشێوی و ئاژاوەنانەوە لەنێو وڵاتی عوسمانی هەڕەشەیەک بوو بۆ ئارامی و سەقامگیری و هێز و دەسەلاّتی دەرباری عوسمانی. کۆی ئەم ڕووداوانە بووە هۆی لێکمۆڕبوونەوەی هەردووک دەربار. دۆستایەتی و دراوسێیەتی و لێکتێگەیشتن جێی پێ لێژبوو و دوژمنایەتی و گرژبوونەوە، جێی گرتەوە.

کەوایە دەکرێ ئاماژە بەو هۆکارانە بکەین، کە هەر لەدەستپێکی سەفەوییەوە بوونە هۆی تەشەسەندنی دوژمنایەتییەکانی نێوان ئێران و عوسمانی:

---

(١) براون، ادوارد، تاریخ اربیات ایران، ترجمه شید یاسی، تهران، چاپخانه روشنایی، ١٣١٦، ص٥٤.

ا- دوژمنایەتی و ناکۆکی مەزهەبی (ئایدۆلۆژیای- سوننە و شیعە).

ب- نەسازان و ناکۆکی لەسەر ئاناتۆلیا (سەرچاوەی دابینکردنی هێزی سەربازی هەردووک بەرە).[١]

ج- سیاسەتی رۆژئاوا بۆ پشتیوانیکردن لە سەفەوییە لەجیات ئاق قۆیونلو (چونکە ئەگەر ئاق قۆیونلو لاواز بوایە، ئەوا دەسەڵاتی عوسمانی سەبارەت بە سنوورەکانی رۆژهەڵاتی بە ئەرخەیانی پاڵی دەداوە و رووی دەکردە ئەوروپا و لەوێوە دەسەڵاتی بەرین دەکردەوە. کەوایە بە دامەزرانی دەسەڵاتێکی بەهێزی وەک سەفەوییە بەپێی خواست و ویستی ئەوروپاییەکان، حوکمەتی عوسمانی لەنێوان ئێران و ئەوروپادا دەکەوتە تەنگەژەوە. دەرباری عوسمانیش ئاگای لەو سیاسەتە بوو هەر بۆیە هاتنە سەر ئەوەی ئەوپەڕی هەوڵی خۆیان بدەن بۆ سڕینەوەی بنە و بنەچەکی سەفەوی).

د- یەنیچرییەکانی ناو سپای عوسمانی کە هۆگری شیعە بوون.[٢]

ە- سەفەوییەکان هۆزە شیعەکانی ئاناتۆلیایان دژی دەسەڵاتی عوسمانی هان دەدا.[٣] و عوسمانییەکانیش ئۆزبەکەکانیان دژی سەفەوییە هان دەدا.[٤]

لەگەڵ ئەوەی سوڵتان سەلیم بوو بە دەسەڵاتدار و میراتی باوکی لە چنگی نا (سەرەتاکانی ٩١٨ک.م/١٥١٣ز) ناکۆکی و دوژمنایەتی نێوان دوو وڵاتەکە بەرەو ئاقارێکیتر هەنگای نا و دەقی نامەکان بە سووکایەتی و هەڕەشە و شەڕ دەبڕایەوە. بەرەبەرە پێوەندییەکانی نێوان دوو وڵات پچڕا.

---

(١) ریاحی، محمد امین، سفارتنامەهای ایرانی، همان، ص٣٣.

(٢) ارزرومی، محمد عارف، انقلاب اسلام بین الخاص و عام، نسخە خطی، کتابخانە ملی، تهران، ص ٢١٦ و ٢١٧. فلسفی نصرالله، جنگ چالدران، مجلە ادبیات دانشگاە تهران، ١٣٣٢، ص٧٣.

(٣) حقی، اسماعیل، تاریخ عثمانی، ج٢، تهران، ١٣٧٠، ص٣٩٧. پارسا دوست، همان صص٣٧٢ تا ٣٧٧.

(٤) انقلاب اسلام، همان صص٣١٨ و ٣١٩. نصرالله فلسفی، همان ص٧٤.

لەو نێوەشدا شیعەی ناوچەکانی بن دەستی عوسمانی و سوننەی ژێر دەسەڵاتی سەفەوی کەوتنە بەر شاڵاوی رق و قینی هەردووک دەربار. خەڵکانێکی یەکجار زۆر لەسەر کەلەڕەقی و وشکەڕۆیی دوو دەربار کوژران.

سەلیم چونکە وشکە موسڵمانێکی سوننەی توند میزاج بوو، فەرمانیدا، کە گشت شیعەکانی ناو دەسەڵاتەکەی لە حەوت ساڵانرا تا حەفتا ساڵان تەبعید بکەن و لە نیشتمانی خۆیان رایانگوێزن و لەوەدا مێژوونووسان دەڵێن هەزاران کەسی کوشت دەنا بۆ هەتا هەتایە لە بەندی کردن.(١)

سەلیم بۆ ئەوەی مۆرێکی شەرعی بەو جنایەتەوە بنێ، داوای لە زانایان و پێشەوایانی سوننە کرد، کە یارمەتی بدەن. سرجان ملکم لەم بارەیە دەڵێ:

(...بەر لەوەی بۆ شەڕ (شەڕی چاڵدێران) سوپا کۆبکاتەوە، زانایانی تورک فتوایان دا، کە کوشتنی هەر کەسێکی شیعە هێندەی کوشتنی حەفتا خاچپەرست لەو دنیای دی خێر دەداتەوە).(٢)

هەرچییەک بێت پاش ئەو فتوایە، کە شەرع رێگەی دا و قانون دەستی ئاوەڵا کرد قەڵتوبڕێک کەوتە ناو هۆزانی شیعە، کە سەرانسەر خاکی عوسمانی گرتەوە. بۆ ئەوەش زەین و فکر و بیری سەربازی تورک تەواو ئامادەکرابوو.

دوژمنایەتی خۆ هەر بەوە نەبڕایەوە وایلێهات سوڵتان سەلیم پاش تەیارکردنی سوپاکەی و هاندانی عەولا خانی ئۆزبەک بۆ پەلاماردانی ئێران، لە ٢٢ موحەڕەمی ٩٢٠ک.م/ ١٥١٤ز لە ئەستەمبوڵەوە بەرەو ئێران بزوت و شەڕێکی قورس و گران و چارەنووسسازی بەسەر دەسەڵاتی پیرۆکەی سەفەویدا سەپاند.

---

(١) لاموش، سرهنگ، تاریخ ترکیه، ترجمه سعید نفیسی، کمسیون معارف، ١٣١٦، ص٩١.

(٢) ملکم، سرجان، تاریخ ایران، ترجمه میرزا اسماعیل حیرت، دنیا کتاب، تهران، ١٣٦٢، ص٢٣٨.

له بڕانەوەی دەسەڵاتی بایەزید تاکوو شەڕی چاڵدێران گەلێک نامە لە نێوان پاشای هەردووک وڵات و هەروەها ئۆزبەکیش دەستاودەست کران، بەڵام لەم وتارەدا نەمانهێناوەتە بەر چاو.

لە زۆر سەرچاوەدا ئیرادیان لە شا سمایل گرتووە سەبارەت بەوەی شا حەولی نەداوە سپایەکی تەیار و مەزن بۆ بەربەرەکانێی لەگەڵ سەلیم ئامادە بکات هەر لەسەر هێزی مەچەکی و ورەی پۆلایینی سەربازەکانی پیداگری کردووە. گوێ‌نەداوەتە را و راوێژی راوێژکارە ژیر و عاقڵمەندەکانی. لە ناوچە و میرنشین و دەسەڵاتە خۆجێیەکانی بن دەستی یارمەتی نەخواستۆتەوە. هەڵکەوتەی جوگرافیایی ناوچەی شەڕەکەی لەبەرچاو نەگرتووە. سوپاکەی لە شاخ و کێوی باکووری خۆێڕا بۆ ئەم دەشتە پان و بەرینەی چاڵدێران راگواستووە.

هەرچییەک بێت، بەپێی نووسراوەی هۆشەنگی مەهدەوی: (سوپای سەلیم بە ٨٥ هەزار سوار و ٤٠ هەزار پیادەوە بە تۆپخانەوە لە قەراجی چاڵدێران لە پەنا خۆی و سوپای شا سمایلیش بە ٣٧ هەزار سواری شمشێر وەشێنی نێزە و کەوان بەدەست لە بەرامبەر یەکتریدا وەستان)[١].

### ٤- شەڕی چاڵدێران:

بەرەبەیانی چوارشەممەی دووەم رۆژی رەجەبە مانگی ساڵی ٩٣٠ک.م/١٥١٥ز سوپای عوسمانی بە فەرماندەیی سوڵتان سەلیم لە بەرامبەر سوپای بچووکی ئێران راوەستا. دوو هێزی نابەرامبەر لەگژ یەکتری رۆدەچوون، کە چارەنووسی خانەدانی سەفەوی بەو شەڕەوە بەند بوو.

نیازی سوڵتان سەلیم بۆ ئارایشتی سوپاکەی ئاوابوو، کە سوپای ئێرانی بخاتە ژێر ئاوری تۆپخانەوە، بەڵام هێرشی کوتوپڕ و خێرا و نەترسانەی رەش سواری قزڵباش، سوپای تورکی عوسمانی پرژوبڵاو کردن. خان

(١) هوشنگ مهدوی، عبدالرضا، تاریخ روابط خارجی ایران، امیر کبیر، ١٣٦٩، ص٢٠.

محەمەدی ئیستانجلو لە پەلامارەکەی بۆ سەر باڵی راستی سوپای عوسمانی سەرنەکەوت و هەر ئەوەش بۆ سوڵتان سەلیم ئیقبالێک بوو و ئەو جارەیان هەر لەسەر راوێژی سەلیم ئاوری تۆپخانە سەربازانێکی زۆری لە هەردووک بەرەی شەڕ خەڵتانی خوێن کرد. سەرکردەی ئازا و بوێری شا سمایل لەو هێرشە سەری تیاچوو و زۆر سەرکردەی دیکەش، کە رەگەڵ خان محەمەدی ئیستانجلو کەوتبوون بوونە قوربانی.[1]

مێژوونووسانی تورک لە بابەت ئەو رۆژەوە دەڵێن: (چالدێران لە هەرە رۆژە تاریکەکانی عوسمانی بوو، مەرگەساتێک بوو، کە هەندێکیان بەنێو رۆژی مردن و رۆژی نەمان ناوی دەبەن...) لەو نێوەدا، کە شا سمایل سووکە برینێکی تێکەوتبوو، [2] ناچار مەیدانی شەڕی بەجێ هێشت. پاش تێکشکانی سوپای ئێران، بە فەرمانی سوڵتان سەلیم، دیلەکان کوژران[3] و ژنانیش بوونە جارییە[4] و کەوتنەبەر دەستی دوژمن.

بۆ یەکەمجار لە مێژووی سەفەوی تەورێز داگیرکرا. هێزی عوسمانی لەژێر فەرمانی ئەحمەد پاشای هەرسک ئۆغلی (هەرسک زادە وەزیری دەستە راستی سوڵتان سەلیم) پایتەختی سەفەوییەکانی گرت و خەزێنە و حەرەمسەرای شا بە تالان چوو و سەلیمیش، شەشی سێپتامبەری (٩٣٠ک.م/١٥١٤ز) پێی نایە تەورێزەوە و هەر لەوێشڕا بۆ سوڵتانەکانی میسر و خانی کەریمە و عەولا خانی ئۆزبەک و کوڕانی خۆی واتە سلێمان سەرکەوتننامەی نارد. هەشت رۆژان لە تەورێز مایەوە و بەلام چونکە

(١) اوزون، چارش لی، اسماعیل حقی، همان، ص٣٨٨.

(٢) ارزرومی، محمد عارف، انقلاب اسلام بین الخاص و عام، مسخه خطی، کتابخانی ملی تهران، ١٣٠٧، ص١٩٨ و پورگشتال فن هامر، تاریخ امپراطوری عثمانی، ترجمه زکی علی آبادی، تهران، امیر کبیر، ١٣٦٩، ص٢٠.

(٣) فریدون بیگ، احمد، منشات السلاطین، قسطنطینه، ص٣٨٧ و پوگشتال، هامر، همان، ص٨٤٦.

(٤) فریدون بیگ، همان، ص٤٦٣.

یەنیچرییەکان بۆ قەڵتوبری خەڵکی بێدەسەڵاتی تەوریز لە فەرمانی سوڵتان سەلیم لایان دا و سوڵتانیش ترسی راپەڕینی یەنیچرییەکانی بوو، ناچار بەرەو وڵاتی عوسمانی رێگەی گەڕانەوەی گرتەبەر.[١]

سەلیم لەو هەشت رۆژەی، کە لە تەوریز مایەوە، نزیکەی هەزار خێزانی تەوریزی لە خاوەن هونەرەوە بگرە تا دەگاتە بازرگان و دەوڵەمەند و شارەزا و شایان و خاوەن پیشە و کارا و لێهاتووی بە ماڵ و منداڵەوە ناردە ئەستەمبوڵ و رایگواستن. لەو نێوەدا بەدیعولزەمانیش، کە نەوەی تەیمور بوو وەبەرکەوت.[٢] سەرەڕای ئەوانەش هەر بەدەم رێگەی گەڕانەوە، شارەکانی نەخجەوان و قارس و ئێرەوان و ئەرزەڕۆمیشی داگیرکرد.

**٥- هۆکارەکانی سەرکەوتنی سوپای عوسمانی لە شەڕی چاڵدێران[٣]:**

✓ هەڵکەوتەی جوگرافیایی ناوچەکە (هەڵەکردن لە هەڵبژاردنی مەیدانی شەڕ بە قازانجی عوسمانی تەواو بوو).

✓ تۆپخانەی ئاگرپژێن و چەکی قورسی عوسمانی و سەرجەم چەکە ئاگرپژێنەکان، کە لە هۆکارە بنەڕەتییەکانی تێکشکانی سوپای ئێران بوو.

✓ زۆربوونی سوپای عوسمانی و تەیاربوونی و بەگشتی بوونی سوپایەکی هەمیشەیی رێکوپێک و تۆکمە و خاوەن نەزمی عوسمانی (یەنیچری).

✓ بەڕێوەبردن و سەرکردایەتیی رێکوپێکی سەربازی بەدەست سوڵتان سەلم و هەندێک لە سەرکردە سەربازییەکانی عوسمانی.

---

(١) هوشنگ سعدوی، عبدالرضا، پیلیشن، ص٢١.

(٢) حقی، اسماعیل، اوزون چارشیلی، همان، ص٢٨٩.

(٣) انجوللو، سفرنامەهای وینزیان در ایران، ترجمە منوچهر امیری، ص٢٥٩ و تزکره الملوک، مشتمل بر تشیکلات اداری و سازمان حکومتی، ...عهد سفویە، بە کوشش محەمەد دبیر سیاقی، کتابخانەی گوهری، تهران، ١٣٣٢، ص١٧. ز پارسا دوست، منوچهر، تاریخ شاه اسماعیل و همان، ص٤٤٨ تا ٤٧٤.

- ✓ کۆنەڕقێکی مەزهەبی عوسمانییەکان لە قزلباشانی شیعە و لە مەزهەبی شیعە.
- ✓ تەماعی سەربازانی یەنیچرییەوە بۆ غەنیمەتەکانی شەڕ.
- ✓ سەرنجنەدان و گوێنەدانی قزلباشەکان بە بابەتە سەربازییەکان. (کۆکردنەوەی زانیاری و بابەتی سیاسی).
- ✓ نەبوونی سوپایەکی خاوەن نەزم و تۆکمەی هەمیشەیی لە ناو دەسەڵاتی شا سمایلدا.
- ✓ تەیار نەبوونی سوپای سەفەوی بە کەرەسەی پێویست و هەروەها بە کەلوپەل و چەکی قورسی سەربازی.
- ✓ کوژرانی سەرکردە بەناوبانگەکان و خیانەتی هەندێ لە سەرکردەکان بە شا سمایل.
- ✓ هێرشەکانی ئۆزبەک لە باکووری رۆژهەڵاتەوە و سەرقاڵبوونی هەندێک لە سوپای سەفەوی بۆ پاراستنی ئەو سنوورانە.
- ✓ جەماوەری خەڵکی ئێران دڵیان بۆ مەزهەبە نوێیەکە نەدەچوو و ئۆگری نەبوون (زۆرتری خەڵکی ئێران تا بەدەسەڵاتگەیشتنی سەفەوی سوننە بوون).
- ✓ سەرنج نەدان و گوێنەدانی شا سمایل بە دەنگ و را و راوێژی سەرکردە بە ئەزموونەکانی، کە ئەزموونی شەڕی عوسمانییەکانیان هەبوو.
- ✓ شا گوێی نەدەدایە پێشبینییەکان و بەلایەوە گرینگ نەبوون، لەسەر ئەم حاڵەشرا سپاکەی بۆ شەڕ ئامادە نەبوو.
- ✓ سیاسەتی دەرەوەی سەفەوی لاواز بوو و پێوەندییەکی گەرموگوڕی لەگەڵ ولاتانی دیکە نەبوو.
- ✓ سیخوڕی لەو ناوە رۆڵێکی کەمڕەنگی گێڕا و بایەخ نەدرا بە کۆکردنەوەی زانیاری.
- ✓ کاتی دەسپێکردنی شەڕ و شوێنی شەڕ بایەخی پێ نەدراوە.
- ✓ تاکتیکی نەشیاو نابەجی لەکار کراوە ئاستی پلەی فەرماندەیی سوپا لە سوپای شا سمایل لەبەرچاو نەرگیراوە.

هەڵبەت ئازایەتی و جەنگاوەری و فیداکاری و خۆبەختی سەرباز و فەرماندە و سەرکردەی ئێران خۆی باسێکی نەبڕاوەیە و ڕۆمانێکی هەرمان، بەڵام ئەگەر ئەو ئیرادەیە، سیاسەتی ڕێکوپێک و کامڵ و سەرکەوتووی لە پشت بووایە و سوپا تەیار بووایە بە چەکوچۆڵی سەردەمی خۆی، ئەوە روون و ئاشکرایە، کە سەرەڕای زۆربوونی هێزی دوژمن، سەرکەوتنی ئێرانییەکان حاشا هەڵنەگر بوو، بەم حاڵەشەوە ئەو ڕۆژە ڕۆژی پەسلان و نەمان و پەرەوازەبوونی سوپای عوسمانی بوو[1].

**٦- دەرەنجامەکانی شەڕی چاڵدێران:**

ئەگەرچی شەڕی چاڵدێران بۆ دەسەڵاتە تازە پێگرتووەکەی سەفەوی زۆر قورس و گران کەوت، بەڵام ئەو شەڕە زۆر شتی روون کردەوە و پەردەی لەسەر زۆر نادیاران لادا. بەجۆرێک، کە هەر لە هێرش و پەلامارەکانی عەرەبی موسڵمان بۆ سەر ئێران تاکو کوژانەوەی مۆمی دەسەڵاتی ئاق قۆیونلووەکان، هیچ دەسەڵات و حوکمەتێکی سەربەستی نەتەوەخوازی سەر بە ئایینێکی سەربەخۆ قەت لەو ئێرانەدا سەری نەگرت و لە دایک نەبوو.

شەڕی چاڵدێران خاڵێکی وەرچەرخان بوو لە دەسەڵاتی سەفەویدا هەم بۆ مانەوە و پاراستنی ئێران و هەمیش بۆ بەرینبوونەوە و تەشەنەکردنی گێرەوکێشە و شەڕ و ململانێی ناوخۆ. لێردا ئاماژە بە هەندێک لە دەرەنجامە ناوخۆییەکانی شەڕی چاڵدێران دەکەین.

---

(١) امیری، منوچهر، سفرنامەهای وینیزیان در ایران، ص٢٥٩ و از همان کتاب به نقل از ابوالقاسم طاهری، تاریخ سیاسی و اجتماعی ایران، ص١٦٥.

**١-٦ دەرەنجامە ناوخۆییەکان:**

- ✓ سەربەخۆیی و سەربەستی ئێران پارێزرا و بەرگری کرا لە دەولەت بوونی خاکی ئێران لە نێو عوسمانی و ئۆزبەکان.
- ✓ رۆڵی تۆپخانە و چەکە ئاگرپژین و چەکە قورسەکانیتر بۆ شا سمایل و سەرکردەکانی شا سمایل روون بۆوە.
- ✓ بۆ ئیرادەی پێشەوای کامڵ و زانا لێکدانەوەیەکی دیکە دەکرا و، پلەی پێشەوای کامڵ و بی عەیب و عار وردەوردە نزم دەبۆوە.
- ✓ تەورێز پایتەختی سەفەوییە داگیر کرا و تالان و چەپاوی خەزێنە و سامانەکان و راگوێزانی دەست رەنگینی خاوەن هونەر و پیشە بۆ ئیستامبۆڵ بۆ شا مایەوە.
- ✓ توندوتیژییە مەزهەبییەکانی ناو ئێران بۆ سەر ئەهلی سوننە لە سایە سەری بەرگری لە سەرهەڵدانی بشێوی و نائارامی ناوخۆ و دەرەوەی ئێران هێورهێور کەم بۆوە.
- ✓ کوشت و کوشتارێکی زۆر لە سوپای ئێران لە قزڵباشەوە بگرە تا ئەوانیتر لە رۆژی شەڕدا کرا.
- ✓ دژایەتی و ناکۆکی لە نێوان قزڵباش و خەڵکی توورە سەری هەڵدا.
- ✓ سەرچاوە مرۆییەکان و سەرچاوەی ماڵی و دارایی و فەرهەنگی ولاتانی ئیسلامی خاپوور و وێران کران (ئێران- عوسمانی- ئۆزبەک).
- ✓ پلە و پایەی سەران و سەرکردەی هۆزی قزڵباشان هەر لە دەسپێکی دەسەلاتی شا تەهماسوبی یەکەمەوە تا هاتنی شا عەباس بۆ ناو دەربار بۆ ماوەیەکی کەمیش بێ بەرز بۆوە.
- ✓ کێشە و هەراو ئاژاوە لە ئەیالەتەکانی ناوخۆی ئێران و میرنشینی دەوروبەری سنووری عوسمانی لەبەر لاوازی و بی دەسەلاتی حوکمەتی ناوەندی ئێران بۆ چاودێری بەسەر گشت ناوچەکان و نەبوونی دەسەلاتێکی نەتەوەیی سەری هەڵدا.

✓ ئاستی هەناردە بەتایبەت هاوڕیشم دابەزی عوسمانییەکان بەرگری هاتنی کەلوپەل و دراو بۆ ناو ئێران بوون و رێگەی هاوڕیشم زۆر پیس کۆنترۆڵ دەکرا. باج و خەراجی یەکجار زۆر بۆ کالای ئێران دەستێندرا.

✓ سیستەمی پەروەردەی وڵات تاکو سەدەی پێشوو گوێی پێ نەدرا و باری زانستی و پیشەیی ئێران بە ئەورووپاوە پابەند بوو.

✓ هاوسەری شا سمایل بەدیل گیرا و ئیرادەی شا دابەزی (مەنوچەهر پارسا دوست لە مێژووی شا سمایلی یەکەمدا، لاپەڕە ٤٧٧ تا ٤٨٠ بە دیلگیرانی تاجلو خاتوون هەر رەت دەکاتەوە).

**٢-٦ دەرەنجامە دەرەکییەکان:**

١- شا سمایل بۆ یەکگرتنی لەگەڵ حوکمەتەکانی ئەورووپا و میسر وەخۆ کەوت و هەر ئەوەش بوو بە رێبازی دەسەڵارتدارانی دوای سمایل.

٢- حوکمەتە ئێرانییەکان وانەیەکی مێژوویی لە شەڕی چاڵدێران فێر بوون و خۆیان دەبوارد لە تێکهەڵچوون و شەڕی راستەوخۆ لە دژی عوسمانییەکان بەتایبەت لە سەردەمی شا تەهماسوبی یەکەم.

٣- بارودۆخێکی بەرگرییانە بە ماوەی سی چارەگە سەدە باڵی وەسەر دەسەڵاتی ئێران کیشا.

٤- کێشە و ناکۆکی سیاسی لە نێوان ئێران و عوسمانی بۆ چوارسەدساڵ هەر نەبڕایەوە (تاکو گرێبەستی ئەلجەزایەر).

٥- دەسەڵاتە خاچپەرستەکان لە چنگ هێرش و هەڕەشەکانی عوسمانی و نەجاتیان هاتن و ئەورووپا حاڵی هاتەوە سەرەخۆ و لەناوچوونی دەسەڵاتە ئورووپاییەکان بوو بە خەون و ئورووپا بوژایەوە، (ئەگەر سێ دەسەڵاتی موسوڵمان مەزهەبی ئێران، ئۆزبەک و عوسمانی بەرەیەکی هاوپەیمانییان پێکهێنابا، ئەوکات حوکمەتەکانی ئەورووپا دەبوو خۆ بەدەستەوە بدەن یان هەر خاکیان بە تورەکە دەچوو).

٦- دەسەڵاتداران و زانایانی ئیسلامی خوێندنەوەیەکی وردبینانەیان کرد بۆ تەڵقینی دەسەڵاتدارە کریستییەنییەکان سەبارەت بە بەرینکردنەوەی

ناکۆکی و دوبەرەکایەتی لە نێوان شیعە و سوننە و لاواز و بێهێزکردنی حوکمەتە موسوڵمانەکان لە بەرامبەر دەسەڵاتەکانی رۆژئاوا.

٧- ئێران و ئۆزبەک لەبەر بەهێزبوونی جێگە و پێگەی عوسمانی لەناو دەسەڵاتی ئۆزبەک و هاندانیان دژی ئێران پێوەندییەکی ساردوسڕ و شیواویان بوو.

٨- ئەوروپاییەکان ئارام ئارام پێیان نا رۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە و بەو جۆرە رێگەیان بۆ کەنداوی فارس و هیند و سەرجەم وڵاتە ئاسیاییەکان و سەرهەڵدانی ئیستعماری کرایەوە و لەوێشڕا بە نیازی تاڵانی سەرچاوە سروشتییە هەرزان و بەنرخەکانی ئەو وڵاتانە و فرۆشتنی کەلوپەل و کالاکانیان لە بازاڕەکانی ئەم وڵاتانە بوون.

٩- شیعە لە بەرامبەر هەڕەشەی سوننە پارێزرا و چوارچێوەی شیعە ساغ بۆوە و سەرجەم هۆزە شیعەکانی ناو دەسەڵاتە سوننەکان بەو دەسکەوتە دڵگەرم بوون و دڵخۆشبوونی.

١٠- ناکۆکی مەزهەبی لە نێوان شیعە و سوننە تاکو سەدەی ٢١ سەرەڕای هەوڵ و تەقالایەکی زۆر بۆ سڕینەوە و کەمکردنەوە هەر نەبڕایەوە.

١١- بووە هۆی ئەوەیکە سەدام حسێن، پەلپ و بیانوویان بە گرێبەستی ئەلجەزایر بگرێ و پاش چوارسەدسالان هێرش بکاتە سەر خاکی ئێران .

## ٧- پێوەندییەکانی ئێران و عوسمانی پاش شەڕی چاڵدێران:

شا سمایل پاش تێکشکانی لە شەڕ و ئەستاندنەوەی پایتەختی خۆی، ئەوجار لە گەورەیی و مەزنی و هێزی سوپای عوسمانی و چەکەکانیان تێگەیشتبوو. لە هەوڵی پەیداکردنی دۆست و هەوالان دابوو و بۆ رێکخستنی پێوەندی دۆستانە، یەکگرتن لەگەڵ میسر(١) و مەجارستان و لە هیستان و سەرجەم وڵاتانی ئەوروپا، نێردراو و سەفیری بە دیارییەوە ناردە

(١) نصرالله فلسفی، جنگ چالدران، مجله دانشگده ادبیات، زانشگاه تهران، ١٣٣٢، ص١٢٤.

دەرباریان. شا هاتە سەر هاندان و دنەدانی پاشماوەکانی سەفەوی لە ئاناتۆلیا بەتایبەت لە ئاماسیە.[1] هەروەها سوپای عوسمانی بە وردی لە پەنا سنووری ئێران وردەکاری و هەر چەشنە جولەیەکی سوپای ئێرانی خستبووە ژێر چاوەدێری و شا سمایلیش لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکیتر جێگۆڕکێی دەکرد و های لە بچووکترین جوڵەی عوسمانییەکان بوو.[2]

ئەگەرچی شا سمایل سێ جاران نامەی بۆ سوڵتان سەلیم نووسی، بەڵام لەبەر قووڵبوونەوەی کێشە و رۆڵی مەزهەب بۆ تەشەنەکردنی ناکۆکییەکان، هەر نەیتوانی سوڵتانی عوسمانی بۆ ئاشتی و ئاشتبوونەوە رازی بکات.

لە سەردەمی سوڵتان سلێمانیش هەر بەم مەنوالە شا سمایل هەوڵێکی زۆری داو نامە و سەفیری ناردە دەرباری عوسمانی و خوازیاری ئاشتی و سڕینەوەی تۆوی رق و دوژمنایەتی بو، بەڵام چونکە سلێمان سەرقاڵی گێرە و کێشەی ناوخۆی وڵات و ئەوروپا بوو، لە نێوان ئەم دوو دراوسێتیە چ بۆ پێکهاتن و ئاشتبوونە و چ بۆ شەڕ و مۆڕبوونەوە هیچ هەوڵێک و هیچ کارێکی ئەوتۆ نەکرا.

---

(١) جی شاو، استانفورد، پیشین، ج١، ص١٥٣ تا ١٥٨. و علی جواهر کلام، تاریخ عصر چاپ خودکار ایران، ١٣٢٠، ص٣١ تا ٣٤.

(٢) بیانی، خانبابا، تاریخ نظامی ایران، جنگهای دوره صفویه، ستاربزرگ ارتشتاران، ١٣٥٣، ص٢٣٠.

# ئەنجام

ئەوەی پاش شەڕی چاڵدێران لە دەرەنجامەکانیدا بۆ ئێمە مایەوە ئەوەیە، کە ئەگەر ئەو شەڕە بە رواڵەت شکانی ئێرانییەکان و هێزی قزلْباشان بووە، بەڵام بووە هۆی پاراستن و مانەوەی دەسەڵاتی سەربەخۆی سەفەوی و درێژبوونەوەی ئەو دەسەڵاتە تاکو ئێستا. سەرەڕای شەڕێکی خوێناوی و سەپاندنی گوشارێکی زۆر و تاقەتپڕووکین بەسەر سەفەوی و سەرجەم زنجیرە دەسەڵاتەکانی پاش سەفەویدا، بەڵام هێشتاش ئاڵای سەربەستی لەسەر ئەم وڵاتە هەر دەشەکێتەوە و گەورەیی مەزنی و شوناسی ئێستای ئێران هەردەم قەرزباری فیداکاریی شا سمایل و سەربازە خۆنەویستە وڵاتپەرستەکانیەتی.

شا سمایل لەگەڵ بە فەرمیکردنی شیعە، سەرەڕای ئەوەی شیعەی لە ئێران زیندوو کردەوە بگرە رچەیەکیشی شکاند، کە خەڵکی ئێران گشتیان لەسەر خاڵێک کۆک بن و لە گەورەترین ئیمپراتۆری جیهان پاراستنی و هەر بەم تێگەیشتن و بیرکردنەوە ژیرانەیەی شا تەهماسوبی کوڕی و لە سای مەزنی عەقڵی نەوەکەی واتە شا عەباس ئێران گەیشتە ترۆپکی دەسەڵات و مەزنترین ئیمپراتۆری لە پاش ئیسلام بۆ هەمیشە رەگی داکوتا.

ئەوەی ئەوڕۆ ئێرانی شیعە لە بەروبۆی حەساوەتەوە لە سای فیداکاری شا سمایل و پێڕەوان و موریدانی گیانبازیەتی. بەرینبوونەوەی ناکۆکییە

مەزهەبییەکانی نێوان شیعە و سوننە، کە هەندێک دەسەڵاتدار و زانای ئاینی ئاگرەکەیان خۆش دەکرد و حوکمەتەکانی رۆژئاوا خۆیان لەبەر گەرم دەکردەوە بوو خاڵێکی لاواز و بە واتایەکیتر بوو بە پاژنەی ئاشیلی ئەم دوو ئاینزایە و ئیمپراتۆری عوسمانی لێک هەڵوەشاند و خەسارەت و زیانێکی زۆریشی بە ئێران گەیاند.

ناکۆکییەکانی نێوان ئێران و عوسمانی تا ساڵی ٩٠٦ک.م هەر نەبڕایەوە و پەیمانی ئاشتی ئاماسیە و دان پیانانی عوسمانییەکان بۆ ئێرانێکی شیعە مەزهەب و سەقامگیر لە هەرە بەرچاوترین رووداوەکانی سەردەمانی سەفەوی بوون. پەیمانێک، کە توانی ئەستوندەکیی شوناسی نەتەوەیی، سیاسی، کە شا سمایل دای کوتابوو، قایمتر و بەهێزتر بکات و بۆ سەرجەم دەسەڵاتەکانی پاش خۆی بە میرات بەجێ بهێڵێ .

# سەرچاوەکان


١- ارزرومی، محمد عارف: انقلاب الاسلام بین الخاص و العام، نسخه خطی، کتابخانه ملی، تهران، ١٣٠٧ه.ق.

٢- انجللو و کاترنیوزینو...: سفرنامه‌های ونیزیان در ایران ترجمه منوچهر امیری، انتشارات خوارزمی، ترجمه و نشر کتاب، تهران، ١٣٥٠.

٣- براون، ادوارد: تاریخ ادبیات ایران، از اغاز عهد صفویه تا زمان حاضر ترجمه رشید یاسمی، جلد چهارم، تهران، ١٣١٦.

٤- بیانی، خانبابا: تاریخ نظامی ایران، جنگهای دوره صفویه، انتشارات ستاد بزرگ، ارتشتاران، تهران، ١٣١٦.

- بوداق، منشی قزوینی، جواهر الاخبار، عکسبرداری شده از نسخه خطی وقفی شاه عباس اول به خانقاه اردبیل، کتابخانه مرکزی دنشگاه تهران، شماره ٣٥١٧.

٥- پارسا دوست، منوچهر: ریشه‌های تاریخی اختلافات ایران و عراق شرکت انتشار، چاپ پنجم، تهران ١٣٦٩ همچنین شاه اسماعیل اول، پادشاهی با اپرهای دیر پای در ایران و ایرانی، شرکت انتشار، تهران ١٣٧٥.

همچنین شاه تهماسب اول، تهران ١٣٧٧ همچنین شاه اسماعیل دوم، شاه تباه شده، همان ١٣٨١.

٦- پورگشتال، هامر: تاریخ امپراتوری عثمانی، ترجمه میر زارکی علی ابادی، به اهتمام جمشید کیانفر، انتشارات زرین، جلد٢ و جلد٣، ١٣٦٧.

٧- ترکمان، اسکندر بیگ منشی: تاریخ عالم آرای عباسی، به کوشش ایرج افشار، امیر کبیر، با شرکت کتابفروشی تایید اصفهان، ٢ جلد، چاپ دوم، تهران، خرداد ١٣٥٠.

٨- تزکره الملوک: مشتمل بر تشکیلات اداری و سازمانی و حکومتی و درباری و طبقات و مشاغل مناصب عهد صفویه، به کوشش محمد دبیر سیاقی، کتابخانه طهوری تهران، بهمن ۱۳۳۲.
٩- جهانگشای خاقان (مولف ئاشناس): تاریخ شاه اسماعیل، با مقدمه و پیوستها و فهارس، الله دتا مضطر، انتشارات مرکز تحقیقات فارسی ایرانی و پاکستان (عکسبرداری از نسخه خطی)، اسلام اباد (پاکستان)، ١٣٦٤.
١٠- جی، شاو، استانفورد: تاریخ امپراتوری عثمانی و ترکیه جدید، ترجمه محمود رمضان زاده، استان قدس رچوی، ١٣٧٠.
١١- حقی، اوزون، چارشی لی، اسماعیل: تاریخ عثمانی، جلد دوم، از فتح استانبول تا مرگ سلیمان قانونی، تهران ١٣٧٠ همچنین جلد سوم از جلوس سلگان سلیم دوم تا معاهده کالوفچه، ترجمه دکتر وهاب لی پژوهشگاه مگالعات و تحقیقات فرهنگی، تهران ١٣٧٢.
١٢- خواند میر، امیر محمود: تاریخ شاه اسماعیل و شاه تهماسب صفوی (ژیل تاریخ حبیب السیر) تصحیح و تحشیه محمد علی جراحی نشر گستره، تهران، پائیز، ١٣٧٠.
١٣- روملو، حسن بیگ: احسن التواریخ، به تصحیح عبدالحسین نوایی بابک، تهران، ١٣٧٥ (برگرفته از جلد یازدهم از مرگ تیمور ٨٠٧ تا ٩٠٠ ه و جلد دوازدهم از سالٝ ٩٠٠ تا ٩٨٥ه کتاب مؤلف می باشد).
١٤- ریاحی، محمدامین: زبان و ادب فارسی در قلمرو عثمانی، پازنگ تهران، ف١٣٦٩ همچنین تاریخ خوی، سر گزشت سه هزار سالٝه منطقه پر حادثه شمال غرب ایران و روابط با دول همسایه، انتشارات توس، تهران ١٣٧٢.
١٥- سومر، فاروق: نقش ترکان آناتولی در تشکیل و توسعه دولت صفوی، ترجمه احسان اشراقی و محمد تقی امامی، نشر گستره تهران، زمستان ١٣٧١.
١٦- سیوری، راجر: ایران عصر صفوی، ترجمه کامبیز عزیزی، نشر کرمز، تهران ١٣٧٢ همچنین ترجمه احمد صبا، تهران ١٣٦٣.

١٧- گاهری، ابوالقاسم: تاریخ سیاسی و اجتماعی ایران، از مرگ تیمور تامرگ شاه عباس اول، کتابهای جیبی، تهران، ١٣٤٩.
١٨- غفاری قزوینی، قاضی احمد بن محمد: تاریخ جهان ارا، تصحیح حسن تراقی، تهران، انتشارات حافظ، ١٣٤٣.
١٩- فریدون بیک، احمد: منشات السلاطین، جلد اول ١٢٧٤، قسطنطینه، جلد دوم، ١٣٧٥ه.ق.
٢٠- فلسفی، نصرالله: جنگ چالدران، مجله دانشکده ادبیات دانشگاه تهران ١٣٣٢ همچنین زندگانی شاه عباس اول، جلد اول از انتشارات محمد علمی از پنج جلد چاپ چهارم، تهران، پاییز ١٣٦٩ و همچنین سیاست خارجی ایران در دوره سفیه، کتابهای جیبی، چاپ دوم ١٣٤٢.
٢١- قزوینی، یحیی بن عبدالطیف الحسینی: لب التواریخ، چاپ انتشارات بنیاد و گویا، تهران زمستان ١٣٦٦.
٢٢- گلپنارلی، عبدالباقی: مجله قزلباش، ترجمه توفیق سبحانی، انتشارات کیهان تهران، زمستان ١٣٦٦.
٢٣- لاموش (سرهنگ): تاریخ ترکیه، با مقدمه زنه پینون، ترجمهس سعید نفیسی، از نشریات کمسیون معارف، چاپ اول، تهران، ١٣١٦.
٢٤- ملکم، سرجان: تاریخ ایران، ترجمه میرزا اسماعیل حیرت، دنیای کتاب، تهران ١٣٦٢.
٢٥- مهدوی، عبدالرچا هوشنگ: تاریخ روابگ خارجی ایران، از ابتدای دوران صفویه تا پایان جنگ جهانی دوم، ١٥٠٠ تا ١٩٤٥م. امیر کبیر، چاپ سوم، تهران، ١٣٦٤.
٢٦- هینتس، والتر: تشکیل دولت ملی در ایران، حکومت اق قویونلو و ظهور دولت، ترجمه کیکاوس جهانداری، انتشارات خوارزمی، چاپ دوم، دی، ١٣٦١.

# شەڕی چاڵدێران و بەهێزبوونی شیعەی عالیمانە

ئەسەدوڵا پووورمووسا کووهـ کەمەر

**پوختە:**

دیارە شەڕی چاڵدێران زۆرتر لەبەر هۆکاری مەزهەبی قەوما. عوسمانییەکان هەر لەسەر ئەو بیروباوەڕە، کە میراتگری خەلافەتن، بە تەما بوون، باڵی خەلافەتیان وەسەر تەواوی موسولمانانی دنیا بکێشن. لەو لاشەوە شا سمایل رەفتارێکی رەق و بەرچاو و توندئاژۆی دەرهەق بە گرو و تەریقەتەکانی دیکەی ئیسلام گرتبووەبەر. خۆشەویستی سەفەوییەکان لە نێو شیعەی غالی، لە ناو سنوورەکانی عوسمانی، ئەوەندەی تریش ترسی و نیگەرانی و دڵەخۆرپەی خستە ناو دەسەڵاتی عوسمانی.

روودانی ئەم شەڕە و تێکشکانی سەفەوییەکان لە چاڵدێران، دەرەنجامی مەزهەبی کەم خایەن و درێژخایەنی لێکەوتەوە. سەفەوییەکان، کە هەر سەردەمی شێخ جونەیدیش تەریقەتی خۆیان راگەیاندبوو، هەر لەو کاتەوە شیعەی سەفەوی رەنگ و بۆی غالی گرتبوو. ئەو جۆرە بیرکردنەوە و بیروباوەڕی غالیبوونە، هەردەم منەتی نایە سەر شێخ و پاشای سەفەوی بەتایبەت لە شێخ جونەیدەوە تا سمایل. چونکە توێژاڵێکی پیرۆزی لە جۆری پیرۆزبوونی خودایانە وەسەر کێشابوون. تێکشکانی چاڵدێران ئەو توێژاڵە

پیرۆزەی لەسەر پاشای سەفەوی دادڕی و بوو بەهۆی دڵساردبوونەوە و هیوابڕانی موریدی قزڵباش لە هەمبەر نەبەزبوون و خودایی‌بوونی پێشەواکەیان، ئەو تێکشکانە لەلایەکەوە مەیدانی ئەنجامدانی چالاکی بۆ زانایانی شیعە چۆڵتر کرد. ئەو زانایانە لەسەر خواستی سمایل و دواتریش تەهماسوب، لە وڵاتانی عەرەبەوە دەهاتنە ئێران و لەلایەکی تریشەوە، وێڕای سەرقاڵبوونی قزڵباش بە ناکۆکێی ناو عەشیرەتەکان و دوورەپەرێزکردن و دووخستنەوەیان لە گۆڕەپانی سیاسەت و ئایین، وەکوو هێمایەکی شیعەی غالی، کەش و هەوایەکی لەباریان بۆ بەرینبوونەوەی شیعەی عالەمی بۆ رەخسا.

## پێشەکی:

شەڕی چاڵدێران ساڵی ٩٢٠ک.م لە نێوان شا سمایلی سەفەوی (کۆچی دوایی ٩٢٠ک.م) و سوڵتان سەلیمی یەکەم روویدا و لە زۆر لاوە رووداوێکی زۆر گرنگە لە مێژووی ئێراندا. ئەو شەڕە، کە یەکەم تێکشکانی بەدیاری بردە ناو دەرباری شا سمایلەوە، دەرەنجامی گەورە و بچووکی بۆ خانەدانی دەسەڵاتداری سەفەوی و یارانی قزڵباشیان لێ کەوتەوە. تەنانەت بە تێڕادیوی زۆرەوە دەکرێ بڵێین، کە زۆر لە پلانەکانی ئەوانی کردە بڵقی سەر ئاو و هەلومەرج و بارودۆخی نوێی پاش شەڕ، بە جۆرێک رەواڵێکی دیکەی گرتەبەر، کە دەیەکانی سەرەتای دەسەڵاتی سەفەوی زۆر بە روونی و ئاشکراییی کردە دوو قۆناغی بەر لە شەڕ و پاش شەڕ و لێکی هەلاواردن.

لە هەلومەرجەشدا مەزهەبی خەڵک و وڵاتەکەش گۆڕا. مەزهەب، کە هەردەم لە مێژووی گۆڕانە مێژووییەکانی ئێراندا رۆڵێکی بەرچاوی بووە، لە سەردەمی سەفەوییەکاندا زیاتر لەوەش خۆی زەق کردەوە. لەم وتارەدا دەمانەوێ دەرەنجامە مەزهەبییەکانی تێکشکانی چاڵدێران دەستنیشان بکەین.

## ا- هۆکاری مەزهەبیی رووداني شەڕی چاڵدێران:

زۆرتر هۆکاری مەزهەبی بوو بەهۆی سەرهەڵدانی شەڕی چاڵدێران، عوسمانییەکان بەپێی بیروڕای خۆیان و شێوەی بیرکردنەوەیان، بە نیازبوون پەلی دەسەڵاتیان باوینە هەموو وڵاتان و چەتری خەلافەتیان وەسەر تەواوی دنیای موسوڵمانان گەڕێ. سوڵتان سەلیم هەمان براوەکەی شەڕی چاڵدێران، زیاتر لە هەمووان پەرەپێدەری ئەم شێوە بیروباوەڕە

بوو.[١] هەر ئەو سوڵتانە بوو پاش شەڕی چاڵدێران، لەڕێی گەڕانەوەیدا نامەیەکی نووسی و دەستبەجێ ئیدیعای خەلافەتی هێنایە گۆڕ.[٢]

لەولاشەوە شا سمایل، هەر لە سەرەتاکانی دامەزراندنی دەسەڵاتی سەفەوی پاش فەرمیکردنی مەزهەبی شیعە، هەڵسووکەوتێکی وشکەڕۆیانە و زەقی تێکەڵ بە توندوتیژیی لەگەڵ سەرجەم گرو و تاقمەکانی دیکەی ئیسلام لە ناوخۆ و لە دەرەوەی وڵات گرتەبەر.[٣] هەروەها مووریدەکانی شا سمایل لە ناو سنوورەکانی عوسمانی، نیگەرانی و ترسیان خستە ناو دڵی سوڵتانە عوسمانییەکان، سەفەوییەکان لەنێو شیعە غالییەکان و لە ناو تاقم و تەریقەتەکانیتری سۆفییەی ناو سنوورەکانی عوسمانی جێگە و پێگەیەکی قایم و پتەویان بوو. هەڵبەت زۆرتری قزڵباشەکانیش سەر بە هۆزەکانی تورک یان تورکمانی ئاناتۆلیا بوون. پشتیوانی و لاگری ئەو هۆزانە لە زنجیرە دەسەڵاتی سەفەوی هەڕەشەیک بوو بۆ سەر هێمنایەتی و ئارامی و سەقامگیری وڵاتی عوسمانی.[٤] بێڕێزی شا سمایل بە گونبەز و مەرقەدی ئەبو حەنیفە نەعمان کوڕی سابتی کوفی و کوشتنی سوننەکان و لایەنگرانی عوسمانی لە بەغدا – پاش گرتنی بەغدا لە ساڵ ٩١٤ک.م، – گەورەکاربەدەستانی عوسمانی بە تەواوی هێنایە سەر ئەم رایە، کە هێرش بکەنە سەر ئێران و سەرکەشی توندئاژۆیی سەفەوییەکان لە رەگ و ریشەوە دەرهێنن. بێگومان ئەگەر رەفتار و کاردانەوەی سۆفی تەبع و ئاشتیخوازانەی سوڵتان بایەزیدی دووەم نەبوا، ئەوا شەڕی عوسمانی و سەفەوی چەندین ساڵ بەر لەو مێژووە دەقەوما.

---

(١) ن. ک، نوایي، عبدالحسین، شاه اسماعیل صفوي ((اسناد و مکاتبات تاریخی))، تهران بنیاد فرهنگ ایران، ١٣٤٧.

(٢) فریدون بیگ، احمد، منشات السلاطین، استامبول، چاپ سنگی، ج٢، ١٢٧٤هـق، ص٣٨٢.

(٣) یوسف جمالی، محمد کریم، تشکیل دولت صفوی، اصفهان، انتشارات امیر کبیر، چاپ دوم، ١٣٧٧، ص ص١٣٢-١٣٨.

(٤) شیبانی، مجیدالدین، روابط ایران و عثمانی، بەرسیهای تاریخی، سال پنجم ١٣٤٠، ش٣.

**ب- دەرەنجامە مەزهەبییەکانی شەڕی چاڵدێران:**

ئەگەرچی توێژەرانی بۆچوونی جۆراوجۆریان هەیە لەسەر مێژوویی شیعە لە خانەدانی سەفەوی، بەڵام خۆ لەوەدا شکمان نییە، کە ئەوان هەر سەردەمی رابەرایەتی شێخ جونەید بیروباوەڕی شیعەیان راگەیاندووە. سەرەتای دەسەلاتی شا سمایلیش هەر لەگەڵ راگەیاندنی مەزهەبی شیعە وەکوو مەزهەبی فەرمی دەستی پێ کرد. بەگوێرەی مێژوونووسە شارەزاکانی سەفەوی، شا سمایل باوەڕی وابووە کە دەرچوونی لە لاهیجان و گشت کردەوەکانی پاش ئەو دەمی، بۆ دامەزراندنی دەسەڵاتی شیعە، وەکوو ئەرکێک لەلایەن خودا و ئیمامانی پاش حەزرەتی عەلی پێی سپێردراوە[1] و بەڕێوەی دەبا.

ئەگەرچی ئەوە پشتڕاست ناکرێتەوە، کە ئایا سەفەوییەکان، ئەم شیعەیەی خۆیان لە سەرچاوەی روون و باوەڕپێکراو هەڵێنجاوە یان ئەوەی، کە بۆ ئۆگربوونیان بەم جۆرە بیروباوەڕە، کاریگەریی موریدە شیعەکانی ئاناتۆڵیایان لەسەر بووە. هەرچییەک بێت گرنگ ئەوەیە، کە ئوە جۆرە شیعەیەی ئەوان و موریدەکانیان هەر لە سەردەمی شێخ جونەیدەوە تا دەسەڵاتی شا سمایل پێداگرییان لەسەر دەکرد و بانگەشەیان بۆ دەکرد و خۆیان بۆ بەکوشت دەدا ، زۆرتر رەنگ و بۆی شیعەی غالی ناو خەڵکی پێوە دیار بوو و بۆ بانگەشە و داسەپاندنی ئەم بیروباوەڕە بەسەر نەیارانی خۆیان هەر لە دەسپێکی دەسەڵاتی فەرمی، ئەو زنجیرەیە لەسەر (بێزاری لە دوژمنانی خوا و ئیسلام و نەبان بوون لەگەڵ سەرانی کافر دامەزرا و، بەو شێوە بۆچوونەی بە واتای خۆیان (تولی و تبری) ملیان لە بانگەشە نا. بیروباوەڕی شیعەی غالیە دەرحەق بە نەوە و نەتیژەی پێغەمبەری خودا و هەبوونی هێما و نیشانەکانی خودا و پێغەمبەر لەناو جەستەی شێخەکانی سەفەوی دەستبەجی پاشایانی سەفەویشی گرتەوە و هەمیشە منەتی ئەو

---

(١) مولف گمنام، جهانگشای خاقان، به کوشش الله د تامضطر، اسلام اباد، ١٣٦٤، ش، ص١٤٦ به بعد.

بیروباوەڕەیان ەسەرەوە دەمێنێ و پاشاکانی سەفەوی لە توێژاڵێکی خودایی‌بوون و پاک‌بووندا پاراست. سەبارەت بەم جۆرە بی غەل و غەوشە خودا ئاساییە، شێخ جونەید و شێخ حەیدەر و شا سمایل لەسەر خۆیان دەدوێن و هەندی جار باسیان لێ کردووە.[1] ئەگەرچی بازرگانێکی ڤێنیزی باس لەوە دەکات، کە شا سمایل خۆیشی ئەو جۆرە بیروبۆچوونەی بەدڵ نەبووە، [2] و بەڵام ئەگەر دیوانی شیعری خەتایی بە هی شا سمایل دابنێین، ئەم شیعر و هۆنراوانە پڕن لە ئیدیعای غالیانە. (میشل م.) مزاوی لە کتێبی دروست‌بوونی دەسەڵاتی سەفەوی بە جوانی دەریبڕیووە کە: (موریدەکانی سەفەوی هەر بە ئاشکرا، شێخ جونەیدیان بە خوا (الله) و کوڕەکەشیان بە کوڕی خوا (ابن الله) ناودەبرد...) ئەوان لە دۆعا و نزاکانیان دەیانگوت: (تەنیا هەر ئەو بوونەوەرە و بێجگە لەو کەسیتر نییە.) شا سمایل خۆی بە خودایەک دەزانی، کە پێی ناوتەوە سەر زەوی.[3]

تێکشکانی سوپای شا سمایل لە شەڕی چاڵدێران دەرەنجامی مەزهەبی زۆر خێرای لێکەوتەوە. رووخانی بیروباوەڕی خەڵکی دەرحەق بە پێشەوای کامڵ و بێ‌عەیب‌وعار و پاشان، چڕژانی پلە و پایەی خودایی-مەزهەبیی‌بوونی شا سمایل.[4] لەو دەرەنجەمانە بوون. ئەسکەندەر بەگی مونشی، نووسەری گەورە و قەڵەمبەدەستی مێژووی عالەم عەباسی، نزیکەی سەدەیەک پاش شکستی چاڵدێران دەنووسێت: (بێ‌شک لەسایەسەری خواوەندی گەورە و مێرەبانەوە قەدەر وایکرد، ، کە شا سمایل

---

(١) سفرنامەهای وینیزیان در ایران، ترجمە دکتر منوچهر امیری، تهران، خوارزمی، ١٣٤٦، ص٤٢٨-٤٢٩.

(٢) همان، ص٤٢٩.

(٣) مزاوی، میشل، پیدایش دولت صفوی، ترجمە یعقوب اژند، تهران، نشر گسترده، ١٣٦٨، ص١٠٦.

(٤) ن. ک: میرزا اسماعیل، تزکره الملوک، بە کوشش و ترجمە سید محمد دبیر سیاقی و مسعود رجب نیا، انتشارات امیر کبیر، ١٣٦٨، ص٣٧.

لەو شەڕەدا تێکشکێ، ئەگینا ئەگەر لەو شەڕەدا سەرکەوتبا، دین و ئیمانی قزڵباشی ساویلکە پێی دەنایە رەهەندێکەوە، کە لە رێگەی راست لایان دەدا و فکر و باوەڕی هەڵە لە زەینیاندا چەکەرەی دەکرد.[١]

گۆشەگیری شا سمایل بۆ ماوەی دە ساڵان و پەنابردن بۆ مەی و ژن و عەیاشی و دووکەڵ و لەکارکەوتن و بێکەڵکبوونی ئاشکرای شا، ئاسەواری دابەزینی پلە و پایەی شا بوو. ئەگەرچی هۆکارە دیکەش پاش شەڕی چاڵدێران کاریگەرییان لەسەر رەفتاری شاسمایلدا بووە.

لەناوچوونی پێشەوای قزڵباشان، رۆژ لەگەڵ رۆژان زیاتر زیانی بە شیعەی غالیە دەگەیاند. سەفەوییەکان هەر لە سەرەتای دەسەڵاتیان، ئایدۆلۆژیای جیهادی مەزهەبییان دارشت و لە رێگەی کوشتن و قەڵتوبڕی هەزاران کەسی بێتاوان، بیروباوەڕی خۆیان پەرە پێدا و بەسەر خەڵکییان داسەپاند.[٢] ئەگەرچی ئەوان هەر لەو رۆژەی یەکەمەوە تێگەیشتن، کە نەبوونی زانایانی دینداری و مەلایانی دوازدە عیلمەی شیحە مەزەب و بەتایبەت کەمبوونی کتێبی دینی و زانایان بۆ پەروەردەی مەزهەبی شیعە لە ئێراندا کۆسپێکی زۆر گەورەیە لەسەر رێیان، بەڵام ئەو کێشەیە هێندە گەورە و بەرین ببۆوە تەنانەت هەر لە سەرەتای دەسەڵاتی سەفەوی هەندێک لە پلە و پایەکانی ناو دەسەڵات و گەورەکاربەدەستانی سەفەوی، لەسەر شیعە هاڕەیان لە برە نەدەکردەوە.[٣]

---

(١) به نقل از: سیوری، راجر، ایران عصر صفوی، ترجمه کامبیز عزیزی، تهران، نشر مرکز، ١٣٧٦، ص٤٥. وەرگێڕی کتێب لەگەڵ هەڵسەنگاندنی گوتەی سیوری و نوسخەی فارس چاپی سنگی سال ١٣١٤هـق، تهران و، چاپ ١٣٥٤ش کە سەرچاوەکەی هەمان نوسخەی خطی چاپ ١٣١٤یە. جیاوازی دەبینێت ئەو دەڵێ: پێدەچێ لە نسخە خطی چاپ ١٣١٤، رستەی دەقە ئەسڵییەکە لەبیر چووە کە بنووسرێ و گوتەی سیوری دروستترە.

(٢) خواند میر، تاریخ حبیب السیر، به کوشش محمد دبیر سیاقی، تهران، انتشارات خیام، ج٤، ١٣٥٣، ص ص٤٨٠-٤٨١.

(٣) فرهانی، منفرد، مهدی، مهاجرت علمای شیعه از جبل عامل به ایران، تهران، امیر کبیر، ١٣٧٧، ص٩١-٩٢.

ڕێک هەر لەبەر ئەم کەموکوڕییە بوو، کە یەکەمجار شا سمایل و دواتریش شا بە شێوەیەکی بەرینتر تەهماسوب، لە دەرەوەی ئێران و لە وڵاتانی عێراق، بەحرێن و بەتایبەت جەبەل عامیل، وەدووی زانای شیعە کەوتن، بەڵام ئەو بانگهێشت و خواستنەوەیەی زانای شیعە، لە سەردەمی شا سمایل قەت سەری نەگرت و بە قازانج تەواو نەبوو چونکە ئەو پێی وابوو بۆخۆی هێمایەکە لە خواوەند و زانایی شیعەی دەرەوە هیچ کات ئەم بوارەیان پێ نەدەدرا، کە بیروباوەڕی عالیمانەی شیعە لە ئێران پەرە پێ بدەن و هەر بەڕاستی سەردەمی شا سمایل پێشوازییەک لە زانایانی شیعەی دانیشتووی وڵاتانی عەرەبنشین نەکرا و دەسەڵاتە شا سمایل هیچ کات نەیخواستن. ئەوە سەردەمی شا تەهماسوب بوو، کە بەشێوەیەکی یەکجار بەرین و بەربڵاو شەپۆلی زانا شیعەکان لە دەرەوەی ئێران رووی کردە دەسەڵاتی سەفەوی، بەتایبەت زاناکانی جەبەل عامیل.

بەناوبانگترین و بەرچاوترین زانای شیعەی کۆچەر، کە لە دەرەوە هاتبووە ئێران لە سەردەمی شا سمایلی یەکەم، موحەقیق کەرەکی بوو. کەرەکی وەک چۆن خولاسەتولتەواریخ دەنووسێت ماوەی پازدە ساڵان لە سەردەمی شا سمایلی یەکەم و دە ساڵانیش لە سەردەمی شا تەهماسوب لە عەڕاق و خۆراسان و ئازەربایجان و هەندێک وڵاتی دیکە مایەوە و (بۆ هەر سەفەر و ئۆردویەکی شا ملی دەنا لە بانگەشە و وتەی پێغەمبەران و نووسین و پێداچوونەوەی نووسراوە دینییەکان و وانەگوتنەوە و فتوادان.)[١] بەڵام جێگەوپێگە و پلەوپایە و دەسەڵاتی موحەقیق کەرەکی لەناو دەسەڵاتی سەفەوی لە سەردەمی شا تەهماسوب لە چاو سەردەمی شا سمایل هەر سەیر هەڵچوو. دەسەڵاتی کەرەکی لەو دوو سەردەمە بۆ هەڵسەنگاندنی نابێت. ئەو لە سەردەمی شا تەهماسوب بوو بە دەمڕاستی شا لە گشت کاروباری سیاسی-مەزهەبی دەربار. تەنانەت شا تەهماسوب لە نامەیەکیدا،

---

(١) قاضی احمد بن شرف الدین الحسین الحسینی القم، خلاصه التواریخ، تصحیح احسان اشراقی، تهران، داشگاه تهران، ١٣٦٣، ج٢، ص٩٤٧.

بەنێوی جێگری ئیمام (ئیمام عەلی مەبەستە. وە) ناوی دەبات و ڕێزێکی زۆری لێ نابوو.[1] خۆی شا تەهماسوب بەم ڕاگەیاندنەی، کە کەرەکی بە جێگری ئیمام ناوبرد ئاستی پلەوپایەی ئەوی بەرزتر لە هی خۆی نرخاند. هەندێک لە زانایانی شیعە، کە لە سەردەمی شا تەهماسوبەوە هاتنە ئێران ئەمانە بوون: شێخ حسێن عاملی کوڕی عەبدولسەمەد حارسی، نووسەری (العقد الدر الطهماسبی) و باوکی شێخ بەهایی بەناوبانگ و هەروەها شێخ عەلی مونشار، کە دواتر شا تەهماسوب کردیە شێخولئیسلامی ئیسفەهان.

## ج- شەڕی چاڵدێران و ئاوابوونی خۆری دەسەڵاتی قزڵباشان (هێمای شیعەی غالی):

دەبی ئەوەمان لە یاد بێ، کە شەڕی چاڵدێران بێگومان، ڕەوتی دوورەپەرێزکردنی قزڵباشانی لە ئێراندا خێراتر کرد. ئەگەرچی سڕینەوە و دوورخستنەوەی قزڵباش هەر لە یەکەم ساڵەکانی تاجلەسەرنانی شا سمایل دەستی پێ کردبوو، [2] بەڵام ئەو سەردەمە ئەمە تەواو ڕوون و ئاشکرا بوو، کە بیروباوەڕی مەزهەبی شا سمایل و قزڵباش هەرچییەک بی، بۆ ئەوان جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبوو و ئەوە ڕیبازە شیعەکەی ئەوان لەگەڵ شیعەی عالیمانەی زاناکان زۆر لێک دوور بوون، [3] باڵام لەو لاوە سڕینەوەی قزڵباش و دوورخستنەوەیان لە دەسەڵات بەر لە شەڕی چاڵدێران، بە مەبەستی زۆرکردنی هێز و توانای بەڕێوەبەری دەرباریی ئێران، لەسەر بنەمای قانونی بەرابەری و هاوکێشبوونی هێزی نێوان عەشیرەتە قزڵباشەکان بەتایبەت دوو عەشیرەتی ئیستاجلو و شاملو ئەنجام دەدرا. وەک چۆن باسمان لێ کرد شا سمایل پاش شەڕی چاڵدێران خۆی لە

---

(١) پارسا دوست، منچهر، شاه تهماسب اول، تهران، سهامی انتشار، ١٣٧٧، ص٦٢٢.

(٢) جهانگشای خاقان، پیشین، ص٢٣٨.

(٣) رویمر، هانس روبرت، ایران در راه عصر جدید، ترجمه اژر اهنچی، تهران، دانشگاه تهران، ١٣٨٠، ص٤٢.

کاروباری دەسەڵات دوورخستەوە. کەچی تێکشکانی کەسایەتی شا سمایل وەکوو پێشەوایەکی کاریزماتیکی، مەیدانی بۆ قزڵباشان چۆڵتر کرد، کە بۆ قایم کردنی جێگەو پێگەی خۆیان سوورتر و لێبڕاوتر بن لە چاو پێشتر، بەڵام ئەو بابەتە گرنگە خۆی لە خۆیدا ئاگری رقی کۆنی عەشیرەتی نێوان قزڵباشانی خۆشتر کرد و وای کرد، کە لە کاتی بە دەسەڵات گەیشتنی تەهماسوب یازدە ساڵان وەزعی دەربار ئاڵۆزتر بێ. ئەوان دەربارییان کردە دوو باڵ و پاش ئەوەی بەرەی نەیار و دژ بە دەربارییان رێکخست، دەسەڵاتی ناو دەربارییان لەژێر چنگی خۆیان نا، بەڵام دووکەڵی ئەو ئاگرە، قوڕگی خۆیانی گرت و کورسیی دەسەڵاتی لایەنی رۆحانی قزڵباش سەروبن بوو. قزڵباش وەکوو هێمای شیعەی غالی لە ئێراندا، ئیتر هیچ کات نەیتوانی لەسەر بیروباوەڕی غالی پێداگری بکات. هەر ئەوەش کەشوهەوایەکی چێ کرد، کە رەواڵی سڕینەوەیان لە سەردەمی شا تەهماسوب و سەرەنجام دوورخستنەوەی هەمیشەییان لە دەسەڵات لە سەردەمی شا عەباس هیچ کاردانەوەیەکی بەدوادا نەهات. دەکرێ دان بەوەدا بێنین، کە لەناوچوونی هێزی کاریزماتیکی شا سمایل وەکو پێشەوای و پاشان کەمڕەنگبوونەوەی بیروباوەڕی قزڵباش لە درێژماوەدا هەر بە زەرەدی قزڵباشان بڕایەوە و لەگەڵ دوورخستنەوەیان لە دەسەڵات بیروباوەڕی شیعەی غالیش بوو بە بەردی بن گۆم و لەبەر چاوان بزر بوو و شیعەی زاناکانی لوبنان و بەحرێن بەستێنی بۆ هەموارکرا و پەڕوپۆی دەکرد و پەلی هاویشت و رەگی بیروباوەڕی شیعەی عالمانەی داکوتا.

**دەرەنجام:**

شەڕی چاڵدێران، کە زۆرتر هۆکاری مەزهەبی بوو بە پاڵنەری شەڕەکە، دەرەنجامی مەزهەبی خێرا و هەروەها درێژخایەنی لێ کەوتەوە. ئەو شەڕە هێزی گەورەیی و مەزنی و خودائاسای شا سمایلی تێک شکاند و بناغەی پلەوپایەی پێشەوای لەبن هێنا. شا سمایل هەر لە سەرەتای دەسەڵاتەکەی بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی و کەلەبەری سەرچاوە و ژێدەری زانا شیعەکان داوای لە زانا شیعەکانی وڵاتانی عەرەب کرد، کە بێنە ئێران، بەڵام ئەو زانایانەی بواری ئەمەیان پێدرا، کە لێکۆڵینەوە و بانگەشەیان بێت زۆر کەم بوون. ئەوانیش زۆریان دەم لە پووش مانەوە. دابەزین و سەرەوژووربوونی غلووری شا سمایل بۆ ئەو بیروباوەڕەی، کە خودا لە دەروونی دایە، کەش و هەوایەیەکی لەباری بۆ زانا شیعەکان خۆش کرد، کە دواتر و بەتایبەت سەردەمی شا تەهماسوب دەستیان دایە بانگەشەی شیعەی عالیمانە.

لەلایەکی تریشەوە خۆدوورخستنەوە و خۆکلاکردن شا سمایل بۆ کاروباری دەسەڵات، ژیلەمۆی ناکۆییەکانی قزڵباشی گەشاندەوە. قزڵباشیش چونکە کۆشکی بیروباوەڕیان تێکڕمابوو بۆ ئەوەی کورسییەکانی دەسەڵات لەناو دەربار و وڵاتدا داگیر بکەن لە سەردەمی شا سمایل و شا تەهماسوب خۆبەخۆ کەوتنە رقەبەرایەتی و دوژمنایەتی. شا تەهماسوب هەر دەستبەجی پاش ئەوەی هێزی شا و دەسەڵاتی شای بۆ دەربار گەڕاندەوە، وردەوردە جێ پێی قزڵباشانی لێژکرد. ئەوەی راست بێ ئاوابوونی خۆری دەسەڵاتی قزڵباش خۆی لە خۆیدا کوژانەوەی مۆمی شیعەی غالی بوو.

# شەڕی چاڵدێران و دەرەنجامەکانی

**دکتۆر سلێمان ئەمین زادە**

**پوختە:**

دامەزرانی دەسەڵاتی سەفەوی لەسەر سێ کۆڵەکەی (شیعەگەری، سۆفیگەری، پاشایەتی) و لەسەر سێ چوکڵەی جوگرافیای سیاسیی (ئاناتۆلیا، هەردەوێڵ، جبل عامل) مەزنترین لەمپەر و رووبەڕووبوونەوە بوو لە بەرامبەر مانەوەی بیروباوەڕی خەلافەت و خەلیفەگەری عوسمانی. گەرچی مەغۆل تۆرەمەی شیعەی سڕینەوە، بەڵام سوننە هەر بەدەستی خۆی زیندووی کردنەوە. بیرۆکەی شیعە و خەلافەت، هەمیشە دووبەرەکی و ناکۆکی لێ دەکەوتەوە و هەر ئەوەش شەڕی چاڵدێرانی هەڵاییساند. بۆ تێکشکانی چاڵدێران، هۆکاری زۆر گرنگ بوونە هاندەری تێکشکانەکە.

بۆ لایەنی ناوخۆی ئاسەواری شکستی شەڕ دەکری ئاماژە بەمانە بکەین: (رووخانی شێوەی بیروباوەڕی نیوەخودایی) و گەڕانەوەی قزڵباش بۆ سەردەمی بیروباوەڕی عەشیرەتگەڕی، داخوازی زۆر و دەست تێوەردان لە کاروباری ناوخۆ، بەدیلگیرانی ژنی شا سمایل (بێهروزە خاتوون) و راگوێزانی هونەرمەند و زانایان بۆ وڵاتی عوسمانی.) سەبارەت بە لایەنی دەرەوەی ئاسەواری شەڕەکە: سەرەتای هاتنی داگیرکەر بۆ خاکی ئێران بۆ پێکهێنانی بەرەی دژەعوسمانی و لەڕاستیدا نەپسانەوە و زیندووکردنەوەی شەڕی خاچپەرستی لە قۆناغی گواستنەوەدا. لە هەوادان گرنگتر ئەوەیە، کە بنەماکانی شەرعی بوونی دەسەڵاتی سەفەوی بە شێوەیەکیتر نەوژن کرانەوە و ناچار شەرعیبوون لە سەردەمی شا عەباس لەگەڵ مەشروتەبوونی دەسەڵات یەکیان گرت و تێکەڵ بوون.

## پێشەکی:

دەسەڵاتی سەفەوی، لە چاو ئەو زنجیرە دەسەڵاتانەی، کە بەر لە سەفەری حوکماتیان کردووە، زیاتری عومر کرد و مێژوونووسانیش لە زۆر شوێندا ئەوەیان پشتڕاست کردۆتەوە، بەڵام سەرەڕای ژیانی دوورودرێژی سەفەوی، خۆی بە دەسەڵات گەیشتنی خانەدانی سەفەوی چەخماخەی سەردەمێکی نوی و خاڵێکی وەرچەرخان بوو لە مێژووی نوێی ئێران. بۆ ئەمەش دوو بیانووی زۆر گرنگ دەخەینە بەرچاو:

١- بەر لە ساڵی ٨٨٠ک/١٥٠١ز و هەر لە سەرەتاکانی سەدەی حەوتەمی زایینی، کە عەرەب هێرشی کردە سەر ئێران و داگیری کرد، ئەم وڵاتە (ئێران) یان هەردەم بەشێک بووە لە ئیمپراتۆرێکی بەرین یان ئەوەی، کە لە نێوان دەسەڵاتە میرنشین و خۆجێییەکاندا دابەش بووە.

٢- ڕاگەیاندنی ئایینی شیعە وەکو ئایینی فەرمی دەسەڵاتی نوێ، کاریگەرییەکی هێند بەهێزی بوو، کە پاش تێپەڕبوونی سەدەیەک، ئێرانی شیعە مەزهەب خۆی لە دراوسێی سوننە مەزهەب-ئیمپراتۆری عوسمانی و مەغۆل و ئۆزبەک- بە تەواوی هەڵاوارد.(١)

لەگەڵ دامەزرانی حوکمەتی سەفەوی، شوناسی سیاسی-مەزهەبی ئێرانییەکانیش بە ڕابەرایەتی (پێشەوای کامڵ و بێعەیب و عار) لەسەر بنەمایەکی واقعی دارِژا و چووە ناو مەیدانی کردەوەوە. هەر ئەو جارِدانەش لە بواری بیروباوەڕی سیاسی-سەربازییەوە وڵاتی گۆڕی. لێکدانەوە و شیکردنەوەی تایبەتمەندی شیعەبوونی مەزهەبەکە و، فەرمیبوونی و تێکەڵبوونی سۆفیگەری لە بواری جوگرافیای سیاسییەوە سێ چوکڵەیەکی دامەزراند، کە ئاناتۆلیا و هەردەوێڵ و جەبەل عاملی لێک دەدا. بانگەشەی سۆفییەکانی سەفەوی بۆ تەریقەتی سەفەوی، ڕاپەڕینەکانی وڵاتی ئاناتۆڵیا، سوڵتانە تازە بە دەسەڵات گەیشتووەکانی وڵاتی

---

(١) جعفر ولدانی، اصغر، بررسی تاریخ اختلافات مرز ایران و عراق، تهران، ابن سینا، ١٣٧٢، ص٣-٤.

سوڵتانەکانی راچڵەکاند و ناچار لە بەرامبەریدا وەستان. تێکشکانی ئۆزبەک ساڵی ٩٢٠ک.م لە شەڕی شا سمایلدا هەردووک دراوسێی موسوڵمانی بەرەو هەڵدێڕی شەڕ رەوانە کرد.

شەڕی چاڵدێران بوو بە سەرەتای زنجیرە شەڕەکانی نێوان ئێران و عوسمانی و لەگەڵ ئەوەشدا گرنگترین شەڕی پاش ئیسلامیش بووە. ساڵی ٨٥٦ک/١٤٥٣ز سوڵتان محەمەدی فاتیح قوستەنتەنیەی گرت و دەرەختی هەزار ساڵەی ئیمپراتۆری بیزانسی لەبن هێنا. ئەو رووداوە مێژووییە لە بڕانەوەی سەدەکانی ناوەڕاست و سەرەتای سەردەمانی نوێ قەوما. لە ئێرانیش نیو سەدە پاش دامەزرانی ئیمپراتۆری سەفەوی لە ٩٠٧ک/١٥٠٣ز زنجیرە دەسەڵاتی سەفەوییە لەسەر دەستی شا سمایل بنیات نرا. لەگەڵ دامەزرانی دەسەڵاتی سەفەوی، شا دەماری ژیانی ئێران خۆێنی تێگەڕا و ئێران لە چنگ داگیرکەران و لە چنگ تورکی عوسمانی خۆی دەرباز کرد و هەر ئەم دەسەڵاتەش، دەسەڵاتی میرنشینی و عەشیرەتی لێک هەڵوەشاند و خستیە ناو لاپەڕەکانی مێژووەوە. سەفەوییەکان بەو سیاسەتە توانیان شەڕابی یەکیەتی و یەکگرتن لە ئێران هەڵدەن و دەسەڵاتێکی تۆکمە و یەکپارچە و سەقامگیر لە ئێران بنیات بنێن (ئێران بەدرێژایی ٩٠٠ ساڵان هەر ببووە گۆڕەپانی شەڕی ناوخۆ و هەردەم پێخوستی پێی بێگانە بووە).[١]

یەکێک لە هۆکارە ئەسڵییەکانی سەرکەوتنی سەفەوییەکان، سەرکەوتنی بێوێنە و مەزنی ئەوان لە نێو غالییەکانی شیعە و تەریقەتەکانی دیکەی سوفیگەری بوو، کە لە سەردەمی هێرشی مەغۆلی بۆ ئێران، پەڕەوازەی ناو وڵاتی عوسمانی ببوون. ئەم یارە بە ئەمەگانە و ئەم لایەنگرە وفادارانە لەناو دڵی ئیمپراتۆری عوسمانیدا گیرسانەوە و رۆڵێکی زۆر گرنگیان لە پێوەندییەکانی نێوان عوسمانی-سەفەوییە گێڕا.

سێ بزووتنەوەی جەماوەری، کە لە تەمەنی ئیمپراتۆری عوسمانیدا وەکو دەسەڵاتی ئیسلامی خۆی دەرخست بریتی بوون لە:

1- Halili Inalik. The othoman Empire. Istambul, 1956. P.92 .

ا) جێگە و پێگەی ئیسلامی سوننەی دەسەڵاتدار و باو، ، کە هەم لە ناوەندی شارەکان و هەمیش لە ناو غازییەکانی عوسمانی بە ئاشکرایی دیار بوو و گشت سنوورەکانی رۆژئاوای عوسمانی دەگرتەوە.

ب) کاریگەریی یەکجار قووڵی گرو و تاقمی سۆفی و رابەرانی عیرفانی بە بیروباوەڕی جۆراوجۆرەوە لەناو هۆز و عەشیرەتی تورک، کە زۆرتر گوندنشین و کۆچەر بوون.[1]

ج) سەرهەڵدان و لەدایکبوونی هێمنانەی بیروباوەڕەکانی سەر بە شیعە بە رەنگ و بۆی جۆراوجۆر، کە ئەمەش هی گەشە و تەشەسەندنی هێمنانەی ئەو مەزهەبە بوو.[2]

لە نێو ئە تاقم و گروانەدا، تاقمی دەرویشە تورکە ئاوارەکانی ناو کوێستان و دەشت و گەرمێنی ئاناتۆلیا بەرچاو بوون کە دەسەڵاتی عوسمانی نەیدەتوانی پابەندی ماڵ و مەکانێکیان بکات. ئە تاقم و گرووپانە تاڕادەیەک بۆ هەر چەشنە جووڵە و کردەوەیەکی سیاسی-مەزهەبی پشتیان بە سەفەوییەکانەوە گەرم بوو.[3]

ئەو تەریقەت و ئەو گرووانە کاتێک کەوتنە گێژاو و قەیرانەوە، کە سەفەوییەکان وەکو هێزێکی سیاسی و داشدار و پشتیوانی ئەو ڕێبازانە، راپەڕین. لەو کاتەدا دەسەڵاتی عوسمانی هەردەم بە مۆرەمۆڕەوە لێی دەڕوانین و لێیان لە بەهانە بوو و پشتیوانی و پاڵپشتی لێبڕاوانەی ئەو گرووپانە لە دەسەڵاتی سەفەوی، هەڕەشەیک بوو بۆ ئارامی و سەقامگیری لە ئەیالەتەکانی ئاناتۆڵیا.[4] سەبارەت بە

---

(١) سومر، فاروق، نقش ترکان آناتولی در تشکیل دولت صفوی، ترجمه دکتر احسان اشراقی و محمد تقی امامی، تهران نشر گسترده، ١٣٧١، ص٢٨.

(٢) شیبانی، مجیدالدین، روابط ایران و عثمانی، مجله بررسی های تاریخی، ص٢١.

(٣) توفیقی، احمد فریدون بیگ، منشات السلاطین، نسخه خطی، کتابخانه دانشگاه تهران، شماره ٢٤٨٢.

(٤) دهقانی، رضا، واگرایی در ساختار در ساختار روابط ایران و عثمانی در دوره صفویه. مجموعه مقالات همایش صفویه در گستره تاریخ، به اهتمام دکتر مقصود علی صادقی. تبریز، ستوده، ١٣٨٢، ص٣٢١.

رووبەڕووبوونەوەی ئەم دوو وڵاتە بۆ شەڕی چاڵدێران هەندێک هۆکاری کاریگەر بوون:

**١- هۆکاری مەزهەبی:**

بەپێی بیروباوەڕەکانی جیهاد و خەلافەت لە ئیسلامدا، عوسمانییەکان لێبڕابوون، کە دنیایەکی موسوڵمانی یەکدەست دروست بکەن. ئەوان لەسەر ئەو باوەڕە بوون، کە نەک دەسەڵاتدار و بەرپرسی وڵاتی عوسمانین بەڵکو خۆیان بە دەسەڵاتدار و سەرۆکی هەموو وڵاتە ئیسلامییەکان دەزانی.(١)

ئەگەر لەسەر سیاسەتی دەرەوەی دوو دەسەڵاتی سەفەوی و عوسمانی شیکردنەوەیەکی کۆمەڵناسانەمان بێت ئەوا دەبێ خوێندنەوەیەکمان هەبێت لەسەر نموونەی نەریتی (داگیرکردن) و شێوازی تێپەڕبوون و قۆناغی گواستنەوەی ئەم نەریتە لە بەستێنی ئەزموونی مێژوویی ئەو دوو دەسەڵاتە. بەپێی نەریتی باوی ئیسلام، لە روانگەی، یەکەم موسوڵمانەکان، جیهان لە دوو جەمسەری دنیای ئیسلام و دنیای شەڕ پێکدێت، ئەم دیاردەیە بوو بە بنەما و بناغەی بیرۆکەی سیاسی-مەزهەبی ئیمپراتۆری عوسمانی و سیاسەتی دەرەوەی ئەو دەسەڵاتە هەر لەسەر ئەم تەوەرە سووڕایەوە. جا بەڕاستی، تورکە عوسمانییەکان، هەردەم موسوڵمانانی شیعە و ئێرانییەکانیان بە کافر دەزانی(دانیشتووانی دنیای شەڕ).

کەوایە بۆ هێنانە بەر باسی ئەم بابەتە لەو سەردەمەدا دەبێ باسی پێوەندییە چڕوپڕەکانی نێوان سیاسەتی دەرەوە و بارودۆخی ناخۆ لەلایەک و نەزم و نیزامی جیهانی لەلایەکیتر شی بکرێتەوە.

---

(١) مهید، محمد علی، پژوهشی در تاریخ دپلوماسی ایران. مجموعه مقالات همایش صفویه در گستره تاریخ. به اهتمام دکتر مقصود علی صادقی، تبریز، ستوده، ١٣٨٢.

**٢- هۆكاری سیاسی:**

بەپێی روانگەی سیاسی، عوسمانییەكان هەردەم پێیان وابووە، كە بەشی رۆژئاوای ئێران، ئاناتۆلیای باشوور و سووریای باكووری لە بارودۆخێكی هەستیار و ئاڵۆزدان. دانیشتووانی ئەو ناوچانە بەگشتی عەشیرەتی توركمان بوون، پاش شكستی سیاسەتی ناوەندخوازی عوسمانییەكان بەدوای شەڕ و هێرشەكانی تەیموور بۆ سەر ئێران، سووریا و ئاناتۆلیا، ئەو عەشیرەتانە لەو بۆشاییە كەڵكیان وەرگرت و بەهێزتر بوون. خۆی توركمانەكان هەردەم لاگری سەفەوییەكان بوون و پشتیان گرتوون و ئەو خۆشەویستییە كە كاری كردبووە سەر توركەمەنەكان میراتی بانگەشەی سەفەوییەكانی ئەو ناوچەیە بوو .[١]

لەم دواییانەدا باس لە گریمانەیەک دەكرێت، كە لەسەر ئەساسی ئەو گریمانەیە، هۆكارە كۆمەڵایەتی و سیاسییەكان باڵی وەسەر خواست و پاڵنەرە مەزهەبییەكان كێشاوە و قورسایی ئەو هۆكارانەیان پێوە دیارە. بەپێی ئەو گریمانەیە، هۆزە توركمانەكان لەبەر ئەمە روویان كردۆتە ئێران، كە نەیاندەویست و نەشیاندەتوانی لە ناو كۆمەڵگای عوسمانیدا بمێننەوە. چونكە ئاگایان لە هەڵاواردنی عەشیرەتی بوو هەر ئەمە خۆی لە خۆیدا لەمپەرێک بوو بۆ تێكەڵاوبوونیان لەگەڵ كۆمەڵگای عوسمانی. (پێدەچی سەفەوییەكانیش بۆ تێكەڵبوونی عەشیرەتەكان لەناو كۆمەڵگای عوسمانیدا چی وایان لەدەست نەهاتووە) كێشەیەكیتر ئەمەیە، كە رابەر و سەرۆک و گەورەی ئەو هۆزانە بۆیان نەبوو لەناو سوپای عوسمانیدا جێی خۆیان بكەنەوە و پلە و پایەیان بەرزتر بێتەوە، چونكە لەو سەردەمەدا لە وڵاتی عوسمانی نیزامی دەرەبەگایەتی دەسەڵاتدار بوو، بەڵام لە ئێران میرە توركمانەكان نەک هەر دەسەڵاتداری ناوچەی ژێر دەسەڵاتی خۆیان بوون بەڵكو لە ناو حوكمەتیشدا هەر جێگە و پێگەیەی زۆر قایم و پتەویان بوو و ئەژمارێكی زۆریان مۆرەی دەسەڵات بوون.[٢]

---

(١) یوسف جمالی، محمد كریم، تشكیل دولت صفوی، اصفهان، امیر كبیر، ١٣٧٧.

(٢) امیراردوش، محمد حسین. اوزون حسن آق قویونلو و سیاست شرقی-غربی، مجموعه مقالات همایش صفویه در گستره تاریخ، ص١٠-١١.

لایەنێکی دیکەی پێوەندی عوسمانی-سەفەویە، کە براون زۆرتر دەیهەوێ زەقی بکاتەوە و تیشکی بخاتە سەر، وروژانی مافی چارەی خۆنووسین لە ئاستی قەوم یان نەتەوە دایە: ئەگەرچی بزوتنەوە و شۆڕشی سەفەوییە هەوڵێک بوو بۆ یەکپارچەکردنی نەتەوەی ئێران پاش هەشت سەدە و نێو سەلیێشێواوی، بەڵام ناکرێ وەکوو بزووتنەوەیەکی نەتەوەخوازانە ناوی بەرین. هەنووکە زمان و رەچەڵەک، کە چەمکی بنەڕەتی شێوازی بزووتنەوەی نەتەوەخوازییە، بەڵام ئەودەمی ئەم دوو چەمکە رۆڵێکی کەمرەنگیان بووە لە پێوەندییەکانی دوو وڵات. دیارە لە شێوەی هەڵسووکەوتی دەسەڵاتی عوسمانی لە بەرامبەر ئێراندا ئەم دوو چەمکە پشتگوێ نەخراون و کاریگەرییان بووە، بەڵام هەردووک وڵاتەکە جۆرێک یەکپارچەبوونی دەروونی پێوە دیار بوو و بە واتایەکی تر لە بواری کۆمەڵایەتییەوە، بە جۆرێک لە جۆرەکانی هاوکێش و هاوتەریب بوون.(١)

### ٣- هۆکاری دارایی:

لە سایەی گرتنی ئەستەمبوڵەوە، هاتوچۆ و تیجارەتی رۆژهەڵات و رۆژئاوا کەوتە بەردەستی عوسمانییەکان. ئەوروپاییەکان تاقەتی رووخانی ئەم پردە و لەناوچوونی ئەو رێگەیەیان نەبوو. هەربۆیە دەسەڵاتدارانی رۆژئاوا هەر لەگەڵ دەسپێکی دۆزینەوەکانی زانستی لە بڕانەوەی سەدەی پازدەی زایینی، لە هەوڵی دۆزینەوەی رێگەیەکیشدا بوون، کە بەسەر وڵاتی عوسمانییەوە نەبێت.(٢)

ئەوەی تینی دەدا بە ناکۆکییەکانی نێوان عوسمانی و سەفەوی، بەرامبەربوونی هێزی هەردووک دەسەڵاتەکە بوو لە ئاست سیاسەتی پاوانخوازانەی وڵاتانی ئەوروپا.، کە ئێران و عوسمانی بیانویستبا یان نا ناچار دەچوونە ناو گۆڕەپانی سیاسەتی جیهانییەوە. هەندێک لە حوکمەتەکانی ئەوروپا، بۆ بەرینکردنەوەی وڵاتە

---

(١) اسکندر بیگ منشی، عالم آرای عباسی، به تصحیح دکتر محمد حسین رضوانی، تهران، دنیای کتاب، ١٣٧٧، ج١، ص١٥٦.

(٢) گاهری، ابوالقاسم، تاریخ سیاسی و اجتماعی ایران، از مرگ تیمور... تهران، علمی و فرهنگی، ١٣٨٣، ص٥٧.

داگیرکراوەکانی بن دەستیان، چاویان بڕیبووە وڵاتەکانی دەرەوەی ئاسیاوە. هەر ئەمەش دەکرێ پاساوێک بێت بۆ هەوڵی رۆژئاوا بۆ بنیاتنانی پێوەندییەکانی لەگەڵ ئێران و کۆکردنەوەی زانیاری و دەنگ و باسی ناوچەکە.

بەگشتی هۆکارەکانی سەرهەڵدانی شەڕی چاڵدێران دەکرێ لەمانەدا کورت بکەینەوە:

١- رێگەی تیجارەتی رۆژئاوا و رۆژهەڵات بڕا. دواتر ئەم رێگەیە لە تەنگەلانی بۆسفێر و داردانێل کرایەوە و هاوکات عوسمانییەکان بە ئەوروپاییەکانەوە سەرقاڵ بوون وهەر ئەوەش بۆ نەیارانی شیعەی ئاناتۆلیا بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ حوکمەتی ناوەندی دەرفەتی رەخساند.[١]

٢- قزڵباش لەگەڵ مورید و پێڕەوانی سوننەی دژ بە دەسەڵات و حوکمەتی سەفەوی رەفتار و هەڵسووکەوتی نەشیاو و نادروستیان بوو. زۆر لە زانایانی سوننەیان بۆ وڵاتی عوسمانی راو نا و لە وڵاتی باپیریان دەریان کردن و هەر ئەوانەش دەسەڵاتدارانی عوسمانیان دژی دەسەڵاتی تازەپێگرتووی سەفەوی هاندا.[٢]

٣- هەر لە سەردەمی بایەزیدی دووەمەوە دەسەڵاتدارانی عوسمانی و سەفەوی نامەی پڕ لە هەڕەشە و گوڕەشەیان بۆ یەکتری دەنارد. ئەم بوختان و سووکایەتییانە دەرحەق بە یەکتری لە سەردەمی سوڵتان سەلیمی یەکەمەوە تەشەنەی کرد.[٣]

٤- سوڵتان سەلیم سوننەیەکی وشکەڕۆیی و توندمیزاج بوو و دەرحەق بە شیعەی لایەنگرانی سەفەوی و نەیارانی دەسەڵاتەکەی چ لە ئێران و چ لە ناو وڵاتی

---

(١) یوسف جمالی، محمد کریم، زندگانی شاه اسماعیل اول، اصفهان، امیر کبیر ١٣٧٢، ص١١٣-١١٧.س

(٢) محمد مترجم معروف به اسپناقچی، تاریخ انقلاب اسلام بین الخاص و العام. به کوشش رسول جعفریان، قم، انتشارات دلیل، ١٣٧٩، ص١٥١-١٥٥.

(٣) غیاپ الدین بن همام الدین حسینی، معرف به خواندمیر، حبیب السید، به کوشش دکتر محمد دبیر سیاقی، تهران، خیام، ١٣٦٢، ج١، ص٥٠١.

خۆی توندوتیژی دەنواند و هەروەها پێشەوا و زانایانی سوننە بۆ بەرگری لە بەرینبوونەوەی شیعە لەناو وڵاتی عوسمانی بە کەیفی خۆیان بانگەشەیان دەکرد.[1]

٥- ڕێز و حورمەتی دوولایەنەی نێوان عوسمانی و ئێران پاش دامەزرانی دەسەڵاتی سەفەوی لە ناو چووبوو.

بە خوێندنەوەیەکی زۆر سادەی ئەم هۆکارانە، بەم ئەنجامە دەگەین، کە شەڕی چاڵدێران لەمێژبوو ئاورەکەی خۆش کرابوو. ئەو نامانەی، کە لە نێوان سوڵتان سەلیم و شا سمایلی یەکەمدا دەستاودەست کراون باسی قەومانی شەڕێکی حاشالێنەکراو دەکەن.

دامەزرانی لێژنەکانی شەڕ لەناو سوپای سوڵتان سەلیم هەر لەگەڵ گەیشتنی بۆ ناو دەشتی چاڵدێران، خۆشکردنی مەیدانی شەڕێکی خوێناوی دەردەخات. نابەرابەری سوپای دوبەرەی شەڕ گۆڕەپانی چاڵدێرانی کردە مەیدانێک، کە ئیرادە ورەی قزڵباش تەنیا بە زەبری گورچوبڕی چەکوچۆڵی ئاگرپژێن تێک شکا و ئالای سەرکەوتن کەوتە چنگی یەنیچری. سوپای ئێران لەگەڵ کشانەوەی شا و هەڵاتنی بەرەو تەورێز و کوژرانی زۆر سەرکردە و فەرماندەی شەڕ و تەفروتونابوونی ئۆردوی ئێران، کەوتە بەر تالانی تورکی عوسمانی.

شا سمایل لە تەورێز گیر نەبوو و تەورێزی بەجێ هێشت و سوڵتان سەلیم تەورێزیشی گرت، بەڵام بەس هەشت ڕۆژان تاقەتی هێنا. کەمبوونەوەی ئازوقە و توێشووی سوپا، هەڵمەت و پەلامارە چریکییەکانی قزڵباش، ڕێگەی پاشەکشێی عوسمانییەکانی لە خاکی ئێران خۆش کرد.

---

(١) اسکندر بیگ منشی، پیشین، ص٤٣.

## دەرەنجامەکانی شەڕی چاڵدێران:

شەڕی چاڵدێران سەرەتای زنجیرە شەڕەکانی نێوان ئێران و عوسمانی و هەروەها گرنگترین شەڕی پاش ئیسلام بوو. ئەو شەڕە ئاسەواری جۆراوجۆری هەم لە ناوخۆی ئێران و هەمیش لە دەرەوەی ئێران لە پاش خۆی بەجێ هێشت، کە لێرەدا گرنگترین و بەرچاوترینی ئەو ئاسەوارانە دەخەینە بەرچاو:

**١- توانەوەی هێزی سەربازی ئێران**

پاش کوژرانی ئەژمارێکی یەکجار زۆر لە سەرکردە و فەرماندە هەرە بە ئەزموون و ئازاکانی قزڵباش، هێز و توانای سەربازی ئێران تارادەیەک توایەوە.[١]

**٢- بەدیلگیرانی ژنی شا سمایل:**

هەندێک لە مێژوونووسان دەڵێن، بێهروزە خاتوون ژنە مارەکراوەکەی شا سمایل و هەروەها تاجلی خاتوون، دڵدارەکەی شا بەدیل گیران و سوڵتان سەلیمیش لەسەر فتوای زانایانی دینی، بەناوی جاریە، بێهروزە خاتوونی لە تاجزادە جەعفەر چەلەبی، -دادوەری سەربازی- مارە کرد، تاجلی خاتوونیش، کە ببووە جارییەی سەردارێکی عوسمانی بەناوی مەسیح پاشازادە، دوو شەوان لە خێوەتەکەیدا ماوەتەوە و دواتر جوتێک گوارەی لەعلی گرانبایی خۆی بەو نیشانەیەی، کە بە شێوەی دڵ بووە و کەوانەی تایەکیان شکابوو لە چنگ مەسیح ناوە و خۆی دەرباز دەکا.

مێژوونووسانی تورک دەڵێن، کە شا سمایل پاش شەڕی چاڵدێران، هەندێک قاسیدی وەک میر عەبدولوەهاب بە دیارییەوە ناردە دەرباری سوڵتان سەلیم و ویڕای داوای ئاشتبوونەوە، داخوازی رادەستکردنەوەی ژنەکەی لێ کردوە، بەڵام سوڵتان سەلیم گوێی نەداوەتە داواکەی. بە وتەی نووسەری شۆڕشی ئیسلام (انقلاب اسلام) فەرمانی دا نامەیەک بۆ شا سمایل بنووسن:

(بۆ هەتیوەی سەفەوی بنووسن، کە خاوەنشکۆ (سوڵتان سەلیم) دەڵێت: لەسەر دەستی فتوای زانایانی ئەهلی سوننە ژنەکەیم بە شوو داوە با بزانێت و تێبگات

---

(١) محمد مترجم، پیشین، ص٣٠٠.

ئەگەر ژنانی موسوڵمانان لەبەر چاوی مێردەکانیان بخەیتە بەردەسی هەوەسی قزڵباشان ژانێکی چەند گرانە).[١]

٣- جیابوونەوەی دیاربەکر بۆ هەمیشە لە ئێران:

٤- تێکشکانی چاڵدێران نەک هەر بێبنەمابوونی بیروباوەڕی شا سمایلی سەرباەت[٢] بە راسپێراوبوونی مەزهەبیی بۆ شا سمایل روون کردەوە. بەڵکو کاریگەری خستە سەر بیروباوەڕی زۆر لە قزڵباشان دەرحەق بە شا سمایل و ئیمان و بیروباوەڕیانی لە بەرامبەر پێشەوای بێعەیب و عاردا لەرزۆک کرد و رووخاندی. پاش شەڕی چاڵدێران قسە و قسەلۆک لەناو خەڵکی بە دژی شا سمایل بڵاوبوویەوە. پلە و پایەی مەزهەبییەکەی شک و گومانی تێ کەوت. ئەسکەندەر بەگی تورکمان، کە هەردەم بەڕێز و حورمەتەوە ناوی خانەدانی سەفەوی دەبات و هەمیشە هۆگریان بووە سەربارەت بە ئیراد و رەخنەکانی قزڵباش لەسەر شا سمایل دەڵێت:

(عەشیرەتی قزڵباش هێند بە توندی دژی شا هەڵگەڕانەوە، کە لەسەر رێبازی دین و ئیمانیان دەرحەق بە شا، بە تەواوی لایاندا و بە یەکجاری لە شا سمایل دوشک بوون).[٣]

تێکشکانی چاڵدێران نەک هەر دەرحەق بە شا سمایل کاری کردە سەر بیروباوەڕ و هۆگری میرانی قزڵباش. هەروەها نەک هەر لە پلە و پایەی نیوەخودابوونی دابەزاند و توێژاڵی پیرۆز بوونی لێ دادڕی، بەڵکوو خەڵکی ئاسایی و رەشایش هەر روویان لە شا سمایل و لە قزڵباشان وەرگێڕا. خەڵکی تەورێز، کە زامداری بێبەزەی و دڵرەقی سیاسەتە مەزهەبییەکانی شا سمایل بون، لە پاش شکانی چاڵدێران خەشی خۆیان بە قزڵباشان دەڕشت.[٤]

---

(١) محمد مترجم (اسپناقچی) پیشین.

(٢) اسکندر بیگ منشی، همان کتاب، ص٤٣.

(٣) منوچهر، پارسا دوست، شا اسماعیل اول، تهران، سرکت سهامی انتشار، ١٣٨١، ص٤٩٧.

(٤) محمد مترجم، پیشین، ص٣٢١.

٥- هێزی قزڵباش شکا و ناکۆکی لەسەر پێشەوای کامڵ و قزڵباش سەری هەڵدا، کە دواتر لە سەردەمی شا تەهماسوبی یەکەم دەرکەوت.

٦- توندوتیژییە مەزهەبییەکان کەمبوونەوە:

شا سمایل پاش ئەوەی لە شەڕی چاڵدێران بەهایەکی قورس و گرانی خستە پێناو بیرکردنەوەی ساویلکانەی خۆی و خەسارێکی زۆری دا بە بێخەمبوونی لە دوارۆژی شەڕەکە، ئەو راستییەی بۆ دەرکەوت، کە تەنیا ئازایەتی و جەنگاوەری نابێتە ئیمکاناتی شەڕ بەڵکو بیرکردنەوەی ژیرانە و لەکارکردنی سیاسەتی کارا و کاریگەری شەڕ، کاکڵی سیاسەتی دەسەڵاتدارییە. هەربۆیە دەرحەق بە ئەهلی سوننە هەندێک هێورتر بۆوە و لاپەڕەی توندوتیژی و وشکەڕۆیی هەڵدایەوە و فەرمانی دا (لەمە بەدوای هیچ کەس بۆی نییە ئایینی باب و باپیر و نەریتی کەسێک بکاتە بیانوویەک بۆ هەڵاواردن لە کاروباری ناو دەسەڵاتدا و لە سیستەمی داد و دادوەریدا و گشت لا بەرامبەر و مافی کەس پێشێل ناکرێت).[١]

**٧- یەکگرتن لەگەڵ ئەوروپای مەسیحی:**

شا سمایل پاش شەڕی چاڵدێران، بەهاو بایەخی راستییەکانی بۆ دەرکەوت و بەمە گەیشت، کە دەبێ ئاوڕێکیش لەو راستیانە بداتەوە و سەرنجیان بداتێ. شا هاتە سەر ئەو باوەڕە، کە بە تەنیایی ناتوانێ دەروەستی هێزی عوسمانی بێت و شکستدانی ئەستەمە. هەر بۆیە پاش ئەو شەڕەی، لێبڕا لەگەڵ دەسەڵاتدارانی کریستییەنییەکانی ئەوروپا یەکبگرێت (کە نەیاری دەسەڵاتی عوسمانی بوون) بەشکم لە سای ئەو یەکگرتنە و بە پشتیوانی ئەوروپاییەکان-کە زۆرتریان پێڕەو و ئەمەگداری ئایینی مەسیح بوون و دژی ئیسلام دەوەستانەوە- بتوانێ پشتی سوڵتانی عوسمانی لە عەرزێ بدا و ئەو شکستەی قەرەبوو بکاتەوە.

شا سمایل هەوڵی دا لەگەڵ شارلی پێنجەم ئیمپراتۆرەکەی ئیسپانیا-کە ئەڵمان و هیند و هەندێک لە ناوچەکانی ئیتاڵیای لە چنگ نابوو- و هەروەها لەگەڵ ئالبو کەرەک، گەورە کاربەدەستی هێزی دەریاوانی پۆرتەغالیا، کە هێرشی کردبووە

---

(١) یوسف جمالی، پیشین، ص١٠٠.

سەر ئاوەکانی کەنداوی فارس یەکبگرێت و پاش پێکهێنانی بەرەیەکی هاوپەیمان، هێرش بکاتە سەر دەسەڵاتی عوسمانی.(١)

٨- راگوێزانی زیاتر لە هەزار خێزانی پیشەگەر و هونەرمەند، زانا و پێشەوا پایەبەرزەکانی نەیاری دەسەڵاتەکەی سەفەوی، کە لە هەلێک و دەرفەتێک دەگەڕان بۆ دەربازبوونیان لە چنگ دەسەڵاتی شیعە.، کە ئەوەش خۆی ئاسەوارێکی شوم و نگریسی لە پاش خۆی بەجێ هێشت.

تێکشکانی چالدێران ئەزموونێکی یەکجار بە نرخ بوو بۆ شایانی سەفەوی. شا تەهماسوب و شا عەباسی یەکەم، هەردەم ئەو ئەزموونەیان کردە دەستبینی دەستی دەسەڵاتییان و تێگەیشتن، کە حوکمەتی عوسمانی بەهێزە و بۆ رووبەڕووبوونەوە و شەڕکردن لەگە ئەو دەسەڵاتە دەبێ ژیرانە هەنگاو بنێیت. شەڕی چالدێران پردی پێوەندی نێوان ئێران و عوسمانی لەسەر بنەمای دوژمنایەتی و شەڕ و ململانێ داڕشتەوە. و تاکو پەیماننامەی زەهاو (١٥٤٩ک) ئەو دوژمنایەتییە هەر نەبڕایەوە، هەر لە مردنی شا سەفییەوە تا هێرشی ئەفغانەکان، عوسمانییەکان هەڕەشەیەکی ئەوتۆ نەبوون بۆ سەر وڵاتی ئێران و هەندێک ناوچەیان لێ داگیرکردن، بەڵام پاش رووخانی دەسەڵاتی سەفەوی، عوسمانییەکان تەماحیان کردە سەر ئێران و ئەوجار شمشێری قزلباشیان لێ دیار نەبوو، کە سەردەمانێک دەراندەری سنووری ئێرانی دەپاراست و تەنگی بە ئیمپراتۆری عوسمانی هەڵچنیبوو، بەڵام مخابن شا سوڵتان وسێنی سەفەوی، کە دەستێکی بە جامی شەڕابەوە بوو و دەستێکی هەردەم لەناو دەستی نەرم و شلی ژن و کچی دەرباردابوو و دەسەڵاتی دەرباری بە نۆکەر و کەنیزی حەرەمی حەرەمسەراوە بەرەو نەمان برد و لە گێژاوی فەسات و لەناو بەندی دوژمن و لەژێر چنگی نەیارانی سەفەوی خستن.

(١) یوسف جمالی، پێشین، ص١٠٨.

## سەرچاوەکان


١- اسکندر بیک منشی، عالم آرای عباسی، به تصحیح دکتر محمد اسماعیل رضوانی، تهران، دنیای کتاب، ١٣٧٧.

٢- پارسا دوست، منوچهر، شا اسماعیل اول، تهران، شرکت سهامی انتشار، ١٣٨١.

٣- توفیقی، احمد فریدون بیک، منشات السلاطین، نسخه خطی، کتابخانه دانشگاه تهران، شماره ٢٤٨٢.

٤- جعفر ولدانی، اصغر بررسی تاریخ اختلافات مرزی ایران و عراق، تهران، ابن سینا، ١٣٧٢.

5- Halil Inalik. The Othoman Empire Istambul. 1965, p.92.

٦- سومر، فاروق، نقش ترکان آناتولی در تشکیل دولت صفوی، ترجمه دکتر احسان اشراقی و محمد تقی امامی، تهران، نشر گستره، ١٣٧١.

٧- شیبانی، مجیرالدین، روابط ایران و عثمانی، مجله بررسیهای تاریخی، ص.٢١

٨- طاهری، ابوالقاسم، تاریخ سیاسی و اجتماعی ایران از مرگ تیمور، تهران، علمی و فرهنگی، ١٣٨٣.

٩- غیاث‌الدین بن همام الدین الحسینی، معروف به (خواند میر) حبیب السیر، به کوشش دکتر محمد دبیر سیاقی، تهران، خیان، ١٣٦٢.

١٠- محمد مترجم، معروف به (اسپناقچی)، تاریخ انقلاب اسلام بین الخاص و العام، به کوشش رسول جعفریان، قم، انتشارات دلیل، ١٣٧٩.

١١- یوسف جمالی، محمد کریم، زندگانی شاه اسماعیل اول، اصفهان، امیر کبیر، ١٣٧٢.